# بیرەوەرییەکانی ئەحسان نوری پاشا

و: وریا قانع

# بیرەوەرییەکانی

# ئیحسان نوری پاشا

وەرگێڕانی

**وریا قانیع**

چاپی یەکەم

2001

**دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی**
کوردستان ت. «٢٢٢٩٩٩٢»
e.mail:mukriani@yahoo.com

- کتێبی ژمارە: «٥٢»
- کتێب: بیرەوەرییەکانی ئیحسان نوری پاشا
- وەرگێڕانی: وریا قانیع
- هونەرکاری: قاسم قادر
- چاپی یەکەم: هەولێر - ٢٠٠١
- ژمارەی سپاردن «٢١٣»ی ساڵی ٢٠٠١دراوەتێ.
- چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە/ هەولێر

## پەیڤێك

شۆڕشی ئاگری داغ یان بەشێوەیەکی دیکە بڵێین شۆڕشی ئارارات یەکێکە لە شۆڕشە مەزن و بایەخدارەکانی نەتەوەی کوردی ستەم دیدە، کە ماوەی پێنج ساڵێك دەوامی کرد، هەر لەکاتی بەرپاکردنی شۆڕشەکەوە سوپای کورد واتە هێزی چەك هەڵگرو رێکخراوی بەڕێوەبردنی کاروباری دانیشتووانیش لە شێوەی دەوڵەتێکی سەرەتاییدا، رێکخرا و ئالای پیرۆزی کوردستانیش بەسەر لوتکەی چیابڵندو گەردنکەشەکانی کوردستانەوە بەدەم شنە بای ئازادییە وە دەشەکایەوە. ئەندامانی هێزی چەکهەڵگریش بەپێی پلەکانیان نیشانەی تایبەتییان هەبوو، کە پلەی ئەفسەرەکان و سەربازەکانی لەیەك جیادەکردەوە واتە تاڕادەیەك رێکخستنێکی سوپایی خاوەن دیسپلینیان پێکهێنابوو. ئەم شۆڕشە هەرچەندە خاوەنی رێکخستنێکی رێکوپێکبوو و بناغەی دەوڵەتێکی بۆ کورد دارشتبوو هەرگیز چاوەڕوانی کەوتنی لێوە نەدەکرا، بەلام لە بەدبەختیی کورد داگیرکەرانی کوردستان هەرچەندە لە دەروونەوە دوژمنێکی سەرسەختی یەکترن، بەلام لە کاتی پەرەسەندنی هێزی

کورد و گەشەك ردنــی بزووتنــەوەی نەتەوایــەتیی کــورد دەبنــە بــرای گیانی بەگیانیی یەکتر و لەســەریەکدی دەکەنــەوە بــەنوێترین چــەکی سـەردەمەکەیانەوە لــە هەموولایەکــەوە پــەلاماری بزووتنەوەکــەی دەدەن و لـــەناوی دەبـــەن. ســـەرەڕای ئەمـــەش دەوڵەتـــە ئیمپریالیســتەکانیش لــە نانــەوەی فێــڵ و تەڵەکەلــە دژی کــوردو بزووتنەوە رەواکەی و بــۆ یارمــەتیدانی دوژمنــەکانی کــورد بەچــەك و دراوو پسپۆڕی سەربازی هەرگیز کورتییان نــەکردووە و هــەزارو یــەك داویان بۆ ناوەتەوە. بۆیە تاکو ئێســتا ئــەنجامی شۆڕشــەکانی کــورد هەرکەوتن وماڵوێرانی بەشوێنەوە بــووە. تــا کــار گەیشــتە ئــەوە بــە چەکی کیمیاوی ولاتانی زلهێز شارو دێهاتەکانیان کیمیاباران کردین و شــارو شارۆچکەکانیشــیان وێرانکــرد و لــە ئۆردوگــا زۆرە ملێکــاندا کۆیانکردینــەوە. ئەگــەر بــە چــاوێکی ورد تەماشــای شۆڕشــی کــورد بکەین ئەبینین کە کورد بەتەنها لەگەڵ تورك یان فارس یــان عــەرەب نەجــەنگیوە. بەشــداریکردنی فڕۆکــەکانی بــەریتانیا لـــە وێرانکردنـــی شاری سلێمانی و دێهاتەکانی بــارزاندا رۆڵێکــی گرنگیــان بینیــوە. لــە شۆڕشی ئەیلوولیشدا بەچەکی بەرەی ئیشــتراکی و ناپــاڵی هینــدی و فڕۆکەکانی بەرەی ئاشتیخواز دێهاتەکانی کوردستان وێران دەکران و ژن و منداڵی بێتاوانیان ئەکرد بە قــەرە بــرووت. پســپۆری ســەربازی ولاتە عەرەبییەکانیش دەستە پاڵەی خۆیان خستە ســەر ئــەو ئاگرە دژی مرۆڤایەتییەکە ماڵی کوردی پێدەسووتێنرا. نووســینەوەی ئــەم ڕووداوانە، وەکو مێژوویەك بۆ نەوەکانی ئایندەمان گەلێك پێویست و سوودبەخشە. بۆ ئەوەی نەوەی ئایندەمان هیچ گلەییەکمان لێنەکەن و وانەزانن ئێمەی بــاب و باپیرانیــان دەســتە پاچــە لــەرووی ســتەم و

تاوانەکانی داگیرکەراندا دانیشتووین بابزانن کە باب و باپیرانیان لە جەنگی تەنبەتەندا بەپێوە بەرانبەر تۆپ و شەستیری گەورەو بچووکی دوژمن لە پێناوی ئازادی و سەربەخۆیی نیشتمانەکەیاندا جەنگیون. بەبێ چەك تەنها بە بێڵ و داردەستەوە پەلاماری فڕگەی مۆدێرنی دوژمنیان داوەو دەستیان بە سەردا گرتووە و درێژەیان بە هێرشی بێباکانەیان داوە. گیانی پیرۆزیان کردووە بە قوربانی، بڕیاریان داوە لە دوای تەواوبوونی ئاخرین فیشەکیان بە خەنجەرو مشتەکۆڵە پەلاماری دوژمنان بدەن.

خوێنەری بەڕێز هەرچەندە ئەم بیرەوەرییە لەمەو پێش چاپکراوە، بەڵام لەبەر زۆربوونی خوێندەوارانی گەلەکەمان و کەمیی ئەو ژمارەیە کە لێی بڵاوکراوەتەوە، وامان بە باشزانی کە دووبارە لە سەرچاوە فارسییەکەیەوە وەریگێڕینە سەر زمانی کوردی، تینوویەتی کۆمەڵێکی دیکەی پێ بشکێنین و بەشێکی گرنگی مێژووی نەتەوەکەمانیان بخەینەوە بەرچاویان تاکو بە باشی دۆست و دوژمنەکانی نەتەوەکەمان بناسن.

لەوەرگێڕانی ئەم بیرەوەرییەدا لە هەندێ شوێندا ناچاربووین کەواژەیەك یان دەستەواژەیەکی زیادە بخەینە سەر دەقە ئەسڵییەکە ئەویش بۆئەوەبووە، کە خوێنەر باشتر لێی تێبگات. بەو مەرجەش ئەسڵی مانای دەقەکە نەشێوێنێت. بۆ نموونە مامۆستا ئیحسان نوری لە هیچ شوێنێکدا زاراوەی شۆڕشگێڕ یان جاشی بەکارنەهێناوە بەڵکو لەباتی ئەمانە زاراوەی (ملیون، مجاهدین، مدافعین و چریکی) بەکارهێناوە، چونکە لەو سەردەمەدا ئەم زاراوانە نەبوون تاکو بەکاریان بێنێت. ئێمە لە هەر شوێنێکدا بە باشمان زانیبێت بەکارمان

هێناون، لەگەلٚ چەند وشەیەکی دیکەشدا کە بە پێویستی نازانم بگەڕێم بە دوایانا و یەك بەیەکیان دەست نیشان بکەم، بەلاٚم نەمکردووەتە کارێك ناوەرۆکی بیرەوەرییەکە نە بەلای کورداو نەلە دژی تورك بە کاربێنم. ئەم بیرەوەرییانە لە بناغەدا بریتیبوون لە زنجیرە وتارێك کە لە رۆژنامەی کۆهستانا بە فارسی بلاٚوکراونەتەوە.

بەڕێز مامۆستا کاوە بەیاتی کۆی کردووەتەوەو لە مردن رزگاری کردوون و کردوویەتی بەم کتێبە. جگە لەمەش لە سالٚی (١٩٨٦) دا لە سوێس بە زمانی فەرەنسی لەشێوەی کتێبێکدا بلاٚوکراوەتەوە. مامۆستا کاوە بەیاتی لەگەلٚ دەقە فارسییەکەیدا بەراوردی کردووە، بەهۆی باری رامیاریی ئەوسای ولاٚتی ئێرانەوە هەندێك شت لە فارسییەکەیدا پەڕێنراوە، بەلاٚم لە فەرەنسییەکەیدا بە تەواوی نووسراوە. هەندیٚ شتی دیکەش لە فارسییەکەدا هەبووە، بەلاٚم لە فەرەنسییەکەدا نەبووە. ئەمانەی لە ناو جووت کەواندا داناوە و ئاماژەی بۆ کردووە. ئێمە بە پێویستمان نەزانیوە جیایان بکەینەوە، چونکە هەردووکیان بەشێکن لە بیرەوەرییەکان و بە پێی بارودۆخی رۆژگار هاتوونەتەکایەوە، پێویست بە جیاکردنەوەیان ناکات.

مامۆستا کاوە بەیاتی گەلێك دلٚسۆزانە و زیاد لە پێویست خۆی ماندووکردووە پێشەکییەك و چەند لاپەڕەیەکی سەبارەت بە بزووتنەوەی نەتەوایەتیی کوردیشی خستووەتە سەر، چونکە ئێمە تەنها نیازمان بلاٚوکردنەوەی بیرەوەرییەکانی ئیحسان نورییە، بۆیە چاوپۆشیمان لە وەرگێڕانی پێشەکییەکە و ئەو بەشەی دیکەشی کرد. هیوادارم مامۆستا کاوە بەیاتی لێم زویر نەبێت و خوێنەوارانیش لێم ببوورن.

لێرەشدا ئەوەش بە خوێندەواران رادەگەیەنم کە مامۆستا ئیحسان نوری ئاماژەی بۆ ئەو یارمەتییانەی شێخ ئەحمەدی بارزانی نەکردووە، کە کریس کۆچەرا لە کتێبەکەیا کەناوی (بزاڤی نەتەوەیی کورد)ە لێیەوە دواوەو دەلێت شێخ ئەحمەد دووجار هەر جارەی (۳۰۰) چەکداری ناردووە بۆ یارمەتیدانی شۆرشی ئارارات. مامۆستا کاوەش دەلێت شێخ ئەحمەد (۵۰۰) چەکداری بۆ یارمەتیدانی شۆڕشی ئارارات رەوانەکردووە.

لە کۆتاییدا هەزاران سلاو لە گیانی پاك و پڕ لە سۆزەکەی مامۆستا ئیحسان و هەموو شەهیدانی دیکەی رێگای ئازادی و سەربەخۆیی نیشتمانە بێنازەکەمان.

**وریا قانیع**

۲۰۰۰/۹/۱٤

# بیرەوەرییەکانی ئیحسان نوری پاشا

ئاگری، ئاگری، تۆ ئاگر بووی
لە ناو دنیا سەربڵند بووی
لەسەر کوردستان چرابووی
هەڵبە ئاگری، هەڵبە ئاگری

**کورتە مێژوویەك:**

لە دوای کڕنووشبردن لە بەرانبەر بارەگای تۆدا ئەی ئاگری، تۆ ئەی چیای بڵند کە هەمیشە زیارەتگای نەوە دلێرەکانت بووی. چین چینی سەهۆڵبەندانت وەکو لاپەڕەکانی مێژوو، بەسەریەکدا کەوتوون. لە بەرانبەری تۆدا کە رووداوە نادیارەکانی سەدەکانی مێژوو دەگێڕیتەوە، لە بەرانبەر تۆدا ئەی ئاگری کە ناوەکەت لە دێرینەی مێژووییت دەدوێت و پریسکەی گڕکانی تۆ کە سەردەمێك دەوروپشتت لە رووناکیی گەرموگوڕتا ڕاگرتبوو و ئێستاش لە دڵی نەوەکانتا ئاوازە خوانی دەکەیت، لەدوای کڕنووشبردن لە بەرانبەر پەیکەری بەهادارو بەڕێزتا، من کە یەکێکم لە بچووکترین نەوەکانی تۆ، دەمەوێت بە مۆڵەتی تۆ چەند لا پەڕەیەك لە مێژووی پڕلە شانازیت بنووسمەوە.

* * *

ئارارات ئەو چیا گەورەیە کە لە باکووری خۆرئاوای ئێراندا سەری لە ئاسمان دەسوێت، وەکو دیوارێکی بڵندو پایەدار هەمیشە ئەم وڵاتەی لە دەستدرێژیی بێگانان پاراستووە، تاکو ئێستا مۆڵەتی بە هیچ کەسێك نەداوە کە سەرکەوێتە سەر بەرزترین لووتکەکەی.

مەسیحییەکان دەڵێن کەشتییەکەی نوح لە سەر ئەم چیا گەورە نیشتووەتەوە. بەڵام قورئانی پیرۆز ئەم وتەیە بەر پەرچ دەداتەوە. شوێنی نیشتنەوەی کەشتییەکەی نوح بە چیای جوودی کە لە باشووری سنووری تورکیایە دەست نیشان دەکات. ئەم چیایە کە لە سەردەمێکدا کڕنووشگای زەردەشتییەکان بووە ئێستاش رۆگەی نەوەکانی واتە نیشتمانپەروەرەکانی ئێستایەتی. ناوی پڕ شانازیی (ئاگری) کە لە ئاگرەوە وەرگیراوە، وێڕای ئەوەی سالانێکی دوورودرێژ واتە چەندین سەدە لە تەمەنی ئارارات تێپەڕیوە، وەفادارییی رۆڵە خاوێنەکانی نەوازشی دەکێشن و بەپێچەوانەی وتەی مێژوونووسانی عیبری–ئاشووری و یۆنانی ناوی ئاگری گەواهی دەدات کە هیچ کاتێك نەتەوەی کورد چیای ئاگری–ی فەرامۆش نەکردووە، بەفێرکردنی ناوی خۆی بە نەوەکانی خۆی ئەو پەیوەندییە پڕلە ئەوینەی هەمیشە پتەوتر کردووە.

سەلمان نەسری پاشای ئاشوور لە سالّی (١٢٦٠) پێش زایینی ناوی ئاراراتی بردووە، بەڵام دەمرگانی مێژوونووسی ناسراو، بوونی دەوڵەتی بە هێزی ئاراراتی لە شوێنی ئاشکرای خۆیدا بە دوو هەزار سالْ پێش زایینی داناوە. بە پێی بەراوردو لێکۆڵینەوە لە شوێنەوارەکانی ژێر زەوی کە لە شاری (وان)ی پایتەختی دەوڵەتی ئارارات و ناوچەکانی دیکەی دەوروبەری ئارارات دۆزراونەتەوە، لەگەڵ شوێنەوارێکدا کە لە ناوچەی دەریای رەشدا دۆزراوەتەوە، روونبووەتەوە کە دانیشتووانی ئەم دوو ناوچەیە. شارستانیەتێکی هاوبەشیان هەبووە و بەبۆچوون و ئیحتیمالێکی بەهێزەوە دەڵێین سنووری ئارارات تاکو دەریای رەش درێژبووەتەوە.

دانیشتووانی ئارارات تایبەتمەندیی ڕەگەزیی خۆیان لە دەست نەداوە. وەکو ئەو بەردە گەورانە کە لەنێو دۆڵە قووڵەکاندا هەڵکەوتوون و هێزو توانای لافاوە گەورەکان نەیانتوانیوە ئەوبەردانە لە شوێنی خۆیان ببزوێنێت لە بەرانبەری لافاوی هێرش بەرانەی نەتەوە ئاوەکییەکاندا خۆی ڕاگرتووە، هێزو قورسایی ئەو هێرشانە ورەی پێبەر نەداوەو لە ئەنجامدا بە هەمان سیمای سەرەتایی خۆیان دەرکەوتوون. بە ئەگەرێکی زۆرەوە خێڵی ئارارات یەکێکن لە خێڵە گەورەکانی گۆتی، ماوەیەك لە ژێر دەستەڵاتی خێڵە هاو نژادەکانی خۆیاندا وەکو(شۆبار)و نایرییەکان– دا بەسەریبردووە. لە سەرەتای سەدەی هەشتەمی پێش زاینی گەیشتۆتە لووتکەی دەستەڵاتی خۆی. لە ساڵەکانی هەشت سەد تا هەشت سەدو بیست و پێنجی پێش زاینی پاشای ئارارات (منقاش) کە هەمان منقەش چنزا یا مەنوچیهری شانامەیە بەرەو باشوور هێرشی بردووە، بەر پەرچی ئاتور نازپرپال، سەلم نەسر (تورو سەلمی شانامە)ی پاشای ئاشووری داوەتەوە. لە باشووری خۆرئاوای دەریاچەی ڕەزائییە چەندین بەردی نووسراوی بە یادگاری بۆ بەجێهێشتووین. عبرییەکان ناویان لەم دەوڵەتە ناوە ئارارات و ئاشوورییەکان بە ئۆرارتوو، مێژوونووسی ناسراوی یۆنانی هەرۆدۆت، بە (ئالاڕود) ناوی بردووە.

هەرۆدۆت دەڵێت: ((لە دەوروبەری چیای ئارارات هۆزی ئالاڕود، هالدییان دەپەرست))، بێگومان هەر لەبەر ئەوە بەم خێڵەیان وتووە (خالدی یاهالدی). مایەر (ئاراس)ی ناوەندی بەنیشتمانی ئەم نەتەوەیە داناوە. شوێنی ناو براو شوێنی نیشتەجێبوونی خێڵێکی مادەکان بووە بەناوی (ئارزنت). بوونی ناوچەیەك بە ناوی (خالدیا)

له نزیك ترابوزان له سەردەمی ئیمپراتوریەتی رۆمی خۆرهەلاتدا لەوەدەچێت لایەنگری ئەو بۆچوونە بکات کە سنووری ئارارات تاکو دەریای رەش درێژ بووبێتەوە.

لەوەدەچێت بە دروستبوونی دەولەتی گەورەی ماد لە ژێر سەرکردایەتیی هۆخشتەر شادا هۆزی هالدی-ی خستبێتە ژێر دەستەلاتی خۆیەوە و ملکەچی کردبن و بناغەی دەولەتی ئێتینی ئاراراتی لەرزۆك کردبێت. هەرچەندە ئەم پاشایە سنووری دەولەتی مادی تا قزل ئێرمەق (رووباری هالیس) درێژکردەوەو دەولەتە دراوسێکانی ترساند، بەلام کورەکەی کەناوی (ئیختووڤیگو) (کەیکاوس) بوو لێوەشاوەیی باوکی نەبوو، بە زوویی ئەم ناوچەیەی لە دەست دا.

هەندێ جار پاشاکانی ئارارات لە خانەدانی مانائی بوون کە لەباشووری خۆرئاوای رەزائیە- دا فەرمانرەواییان دەکرد. ئەم کارەش بە نۆرەی خۆی بە بەلگەی هاورەگەزبوونی ئەم دوو هۆزە دادەنێت. لە سالی (٦٠٠) پ.ز لەبەرئەوەی ئارارات دەولەتی سەربەخۆی نەبوو کەوتە بەر هێرش و پەلاماری ئەرمەنییەکانەوە.

هەرۆدۆت دەلێت: بەرزیی پلەی شارستانیەتی ئاراراتییەکان وای لە ئەرمەنییەکان کرد کە ئاینی ئەوان قبوول بکەن و ئەم ناوچەیە کە بە بۆنەی هالدییەکانەوە(هایستان)یان پێدەوت، لە دوایدا دایانەوە پال خۆیان، خۆیان ناو نا هالدی یان هایق. هاودینی و هاورەگەزیی ئەم دوو هۆزە، بوو بە هۆی ئەوەی یەکێتی نێوانیان مسۆگەر بکات. لەمە بە دواوە هیچ رێگرییەك لەوە نەدەکرا کە ئەم چیا پیرۆزە نێچیرگای پاشاکان و جێگای رمبازیی سەردارانی ئەرمەنی بێت.

لە دواییدا دەرکەوت ناوی خێڵە جۆربەجۆرەکانی ئاراراتی: کورتی، مارد، ئەمرد-لە مێژووەکانی ئەرمەنیدا بە مار تۆمار کراوە- بوون کە هەر یەکێکیان بەشێك بوون لە خێڵەکانی گۆتی: ئەم تایەفانە نەك تەنها لە خاکی ئاراراتدا- بە گەواهیدانی (ئەسترابۆن) و مێژوونووسانی دیکە- بەڵکو لە تەواوی خاکی مادستان، فارس، ئازربایجان و مازەندەران، هەر بەم ناوانەوە دەژییان. لە دواییدا بە پەیدابوونی ئایینی مەسیحی ئەرمەنییەکان و ئاراراتییەکان بەخواست و زۆرەملێ ئەو ئایینەیان پەسەندکرد.

لە ساڵی (٢٧٩) ی زاینیدا. (ترتاب)ی پاشای ئەرمەنی ئایینی مەسیحی قبووڵکرد، لەدەوروبەری مووشدا سەد هەزار کەسی لە پیاوانی ئایینی هالدی کوشت و بەزۆر دانیشتووانی کرد بە مەسیحی. لە دوای بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام ژمارەیەکی زۆری ئاراراتییەکان لەگەڵ هاوڕەگەزەکانی دیکەی خۆیاندا، واتە کوردەکانی باشوور بە چاو لێکەری، ئایینی ئیسلامیان قبووڵکرد. لە هەمانکاتدا ژمارەیەکیان لەسەر ئایینی مەسیحی-ی خۆیان مانەوە. تەنانەت لەم دواییانەشدا لە نێو کوردەکاندا چەندین بنەماڵە بەرچاو دەکەون کە هێشتا بەشێك لە شوێنەواری ئایینی مەسیحی لە رەفتاریاندا بەکاردەهێنن، هەروەها لەناو ئەرمەنییەکانیشدا مەسیحییان تێدا ماوەتەوە کە زمانی ئەرمەنی نازانن و بە زمانی کوردی دەدوێن. ئەم دوو کۆمەڵە لە پاشماوەی هالدییەکانن کە ئایینی مەسیحییان قبووڵکردبوو، دەستەی یەکەمیان لە دواییدا موسوڵمان بوون، بەڵام دەستەی دووهەمیان لەسەر ئایینی مەسیحی-ی خۆیان مانەوە.

با واز لەم بابەتە بێنین. جیاوازیی بیروباوەڕی ئاییني، ئەم دوو هاو نیشتمانییەی بەردایە گیانی یەکتری. کاتێك ئاییني ئیسلام لەخۆرهەلاتدا گەشەی کردو، دەستەلاتی بەدەستهێنا کەم کەم کوردەکانی ئارارات هاتنە سەر کار. لەوانەش خانەداني شەدادی کە سەر بە خێڵی ڕووادی بوون کە لە دەوروبەری شاری (دیوین)ی پایتەختی دێرینی ئەرمەنستان و لە نزیکی چیای ئارارات نیشتەجێبوون. لە سەرەتاوە لە (گەنجە)و قەفقاز سەڵتەنەتیان بە دەست هێنابوو. لە دواییدا دەستیان بە سەر ئەرمەنستانیشدا گرت. بەم شێوەیە ئارارات دووبارە کەوتەوە ژێر دەستەلاتی نەوە ڕەسەنەکانی خۆی.

لە دەوروبەری سەدەی پێنجەمی کۆچیدا بوو، کە یەکێتیی (کورد–ئەرمەنی) لە بەرانبەر هۆزە تالانکەرەکانی تورك ئەنجام درا. خێڵە تورکەکان دەستی تالان و فەرهوودیان تانزیکی (ئانی)درێژکردبوو. پاشای کورد مەنوچیهر، کورتکردنەوەی دەستی تورکەکانی بە پێویست زانی. مەسەلەی هاودینی نابە لاوە، دەستی دایە شمشێر.

کریکۆری کوڕی (وهاك) کە گەورە ترین و دەستەلات دارترین کەسایەتییەکانی ئەرمەنی بوو، هات بۆ یارمەتیدانی هێزی کورد. چەند ساڵێکیش دوای ئەوە کە ئەرمەنستان کەوتە بەر هێرش و پەلاماری تورك، مەنوچیهری کوردیش هێزی کوردی نارد بۆ یارمەتیدانی ئەرمەنییەکان.

لە ئەنجامداو لە دوای ئەوە کە حکومەتەکانی خودموختاری لەناوچوون، سەردارانی کورد لە ناوچە جۆربەجۆرەکانی کوردستان.

نفـووزی مەعنــەویی خەلیفــەکانی عوسمانییــان بەدۆســتایەتی و وەفاداری راگرتبوو و بەم شێوەیە ئاسایشــی ئــەو ناوچەیــە مسـۆگەر بووبوو و کوردەکان تارادەیەك وازیان لــە داواکـاریی ئـازادیی خۆیـان هێنـا، بـەڵام دووبـارە جارجـارێك لـە گۆشــەو کــەناری هەرێمەکــەدا نەغمەی ئازادی خوازان بەرز دەبووەوە، بەڵام لـەدوای چـەند رۆژێـك خامۆش دەبووەوە.

دانیشـتووانی ئـەم چیایـە پابـەندی ئـاوو خـاکی خۆیـانبوون. بــە دەمارگیرییـەکی هــاورێك لەگــەڵ نائومێدییــەوە شـیعری شــاعیری نەتەوەیی خۆیان (ئەحمەدی خـانی)کـە نزیکـەی (٣٠٠) سـاڵ لـەوەو پێش هۆنیبوویەوە. لەبەر خۆیانەوە دەیانخوێندەوە ئەیان وت:

((ساقی تو ژبۆ خدی کەرمکە یك جرعە مەی دەجـام جەمکـە))

((داجام بەمەی جهان نمابیت هەرچەمە ئیرادەتی خودا بیــت))

((داکشف بێت لەبەرمـە ئـەحواڵ کسـانی دبـتن میسرئەقباڵ))

((ادبارمەوی گـها کـــــمالــــی ئایـــــا بـــــوەقـــابل زوالی))

((یاهروهــادی لــە اســتوابت حتــی وکــو دور منتــها بیــــت))

((قـەت ممکـن ەتـەرژچرخ لولـب تـالع ببــتن ژبۆمــە کوکــب))

((بختە مە ژی بو مەرابیت یار جـارك ببـتن ژخـواب هشــــیار))

((رابت ژمە ژی جهان پناهەك پیـدا ببـتن مـە پادشــاهــەك))

**(لە کتێبە کەدا تەنها ئەم پێنج دێڕەی لێکدراوەتەوە).**

لە دوای چـەندین سـەدە ئـارارات بـووە جیاکـەرەوەی سـنووری ئێران–رووس و عوسمانی. هەروەها بوو بە هێڵێکی راست لـە نێـوان ئاگری گەورەو سنووری رووس و عوسمانی لە ساڵی (١٩١٤) لەنێوان

رووس و عوسمانیدا جەنگ روویدا، هێزەکانی عوسمانی لە دوای چەند شەڕێکی خوێناویدا هەڵاتن. دانیشتووانی دلێری ئارارات ئیتر توانای قبووڵکردنی ئەوەیان نەبوو کەلەمە زیاتر خاکی نیشتمانەکەیان ئەم دەست و ئەو دەست بکات. لەلایەکی دیکەشەوە ئامادە نەبوون دۆستایەتی و وەفادارییان بۆ خەلافەت، بکەوێتە بەرگومان و دوو دڵییەوە. لەم رووەوە دەستیان بۆ چەك برد و بەسەرۆکایەتیی (گور حەسۆ)و(برو حسکی=ئیبراهیم حسکی) دەستیان بە پاراستن و پاسەوانیی خاکی نیشتمان کرد. چەندین جەنگی دلێرانەیان کرد و نەیانهێشت رووسە قەیسەرییەکان پێ بنێنە ناو خاکی ئاراراتەوە. رووسەکانیش لەبەرانبەر ئەم دلاوەری و مەردایەتییەدا بێ هەوڵدان ئاراراتیان بەسەر جەنگاوەرەکانیدا بەجێ هێشت و بەرەو ناو خاکی عوسمانی درێژەیان بەرۆیشتن دا.

پارێزەرانی ئارارات گەلێك جار سنووری خۆشیان دەبەزاند و هێرش و پەلاماری دلێرانەیان بۆ سەر هێڵی پەیوەندی نێوان خۆیان و رووسەکان دەبرد. لە یە کێك لە جەنگەکاندا گور حەسۆ سەرۆکی جەنگاوەرانی ئارارات هاوکات لەگەڵ پەلاماری شەمەندەفەرو رێگای ئاسنی نێوان ماکو-بایەزید کەسەربازی چەکداری دەگوازتەوە، کوژرا.

دوای کوژرانی گور حەسۆ، برو حسکی، بە ئازایەتییەکی جوامێرانە تا کۆتایی جەنگەکە نەیهێشت دوژمنان پێ بنێنە نێو خاکی ئارارات، لەکاتێکدا کە هێزەکانی رووس لە شاری بەدلیسیش تێپەڕیبوون.

ئارارات وەكـو دوورگەیـەك لـە ناوەڕاسـتی دەریایـەك دوژمـن مابووەوە. شەپۆلی هێرشەكانی بەرەو دوا دە كشاندەوەو نیشـتمانی خۆیان لە هەموو بەلایەك دەپاراست.

شۆڕشی گەورەی ئۆكتۆبەر بـوو بـە هـۆی ئـەوەی كـە هێزەكـانی رووس شوێنە داگیركراوەكانی دەرەوەی سنووری خۆیان چۆڵ بكەن و بگەڕێنەوە. هێزەكانی ئەرمەنی لە ژێر سـەركردایەتیی (ئـەنترانیك) پاشا، قارەمانی نەتەوەیی خۆیان پاراسـتنی ناوچـە داگیركراوەكـانی عوسمانییان لە ئەستۆ گرت، بەلام دەشیانزانی بەو رێكخستنە پڕ لـە كەموكورتییـەی خۆیـان نـاتوانن لـە بەرانبـەر لەشـكری عوسمـانیدا خۆیان رابگرن.

كوردەكانی ئاراراتیش لەم كاتەدا بـە سـەرۆكایەتیی برو حسـكی بێ ئـەوەی چاوەڕوانی هـاتنی لەشـكری عوسمـانی بـن، هـێرش و پـەلامارەكانی یـەك لـەدوای یـەكی خۆیـان لـە دژی شـاری بایـەزید دەسـتپێكردبوو. ئارامگـای ئەحمـەدی خـانیی شـاعیری گـەورەی كوردیـان لـە داگیركـەران وەرگرتبـووەوە. بـەلام چـەند رۆژێـك دوای ئەوە، ناچار ئەو شوێنەیان دایەوە بە لە شكری عوسمانی.

لە ساڵی (١٩٢٠) چیای ئـاگری بـووە خـاڵێكی دیكـەی سـەرەتای هێرشـی توركـەكان بـۆ سـەر حكوومـەتی تـازە پێگەیشـتووی ئەرمەنستان. كوردەكانی دەوروبەری ئـاگری لـە ژێـر سـەركردایەتیی لەشـكری (١١)ی تـورك شـارەكانی ئیغدیـر و قلبیـان داگـیركردو گەیشـتنە رووبـاری ئـاراس. لەبـەرەكانی فاغزمـان و قارسیشـدا كوردەكان زۆربەی لەشكری توركییان پێكهێنابوو. لە سایەی دلـێری و خۆبەختكردنیان توانییـان ئـالای عوسمـانی لـە دەوروبـەری سـاڵی

(١٨٧٧) زایینی–دا بگەیەننە سەر سنووری نێوان رووس و عوسمانی و لــەوێش تێپــەڕین. ئاشــکرایە کــورد لــە بەرانبــەر ئــەم هـــەموو خۆبەختکردنانـەدا چاوەڕوانی دەوڵـەتی عوسمـانی بـوون. (!) کـە دەوڵەتی عوسمانی پاداشتی خزمــەت و خۆبــەختکردنی کوردانــی بـە کوشـتنی هـــەندێك لەســەرکردەکانی جــەنگاوەرانی کــورد وەڵامــی دایەوە. یەکەم کەسێك کەلــە ریـزی دوورخراوەکـاندابوو بـرو حسـکی بوو، کە لە هیچ جۆرە خزمەتێکی راستگۆیانە پێدزکێی نەکردبوو. .

* * *

(ئیبراهیم ئاغا) کە لە لای کوردەکان بە ناوی برو حسـکی تـەللو ناسرابوو، لە بنەماڵەی حسە سووری و خێڵی جەلالی بــوو لــە رۆژانــی جــەنگی یەکــەمی جیــهانیدا لەگــەڵ (گۆرحەســـۆکوت) و هـــاوڕێ چەکدارەکانی لە ناو چەی ئاگری دەژیان. ئەمانە توانییان لــە هاتنـە ژوورەوەی سوپای رووســیای قەیســەری بـۆ ناوچـەی چیـای ئـاگری، بەرگری بکەن. لەوە بە دواوە بـرو حسـکی تـەللو ئامـادە بـوو کەلـە بەرانبەر دابین کردنی ئازووقە پەیمان بە رووسەکان بدات، لەپشتەوە پــەلاماری هێزەکانیــان نــەدات کەلــە قەڵــەمڕەوی عوسمـــانیدابوون و خەریکی ئەنجامدانی ئەرکی سەربازی بوون.

لە دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەر لەساڵی (١٩١٧) رووسەکان بــە پەلـەو لـە دوای ئــەوانیش ئەرمەنییــەکانیش قەڵــەمڕەوی عوسمانییــەکانیان چۆڵکردو بەجێیان هێشت. ئەندامانی دەستەکانی برو حسکی تەللو و گور حسۆ کوت پەلاماری ئەرمەنییەکانیان دا. گــور حسـۆ کـوت لـەم رووبەڕووبوونەوانەو لە جەنگێکدا کوژرا. برو حسکی تەللو درێژەی بە بــەرگری کـردن دا. شـاری بایــەزیدی لـە ئەرمەنییـــەکان ســەندەوە.

لەدوای چەند رۆژێك بـە هـاتنی هێزەكـانی عوسمـانی شـارەكەی پـێ سپاردنەوە. برو حسكی تەللو داوای خوشكی محەمــەد ئەفـەندی ـی فەرماندەی بایەزیدی كـردو مـارەیكرد. نـاو بـراو لـە شـاری بایـەزید خانوویەكی دروستكرد و دەستی كرد بە كاسبی.

حسكی تــەللو نـەك تەنـها لـە شۆڕشـێك كەبـە ڕابەرایـەتیی شـێخ سەعیدی گەورە (پیران) بەڕێوە دەچوو، بە شداری نەكردبوو. بەڵكو لەكاتی تێكچوونی شۆڕش بەهاوكاریی خێڵەكانی جەلالی و حەیدەری، بەفەرمانی دەوڵــەتی توركیـە، سـنوورەكانی ئـێران و توركیـەیان لـە رووی شۆڕشگێڕەكاندا، كە لەو كاتەدا خەریكی هــەلاتنبوون بۆئـێران گرتبوو. كوڕی شـێخ سـەعید، عـەلی ڕەزاو خـالید بـەگی حسـەینیش لەناو هەلاتووەكاندا بوون. لەكۆتایی شۆڕشی شێخ سەعید، دەوڵەتی تورك بەرنامەیەكی بۆ دوور خستنەوەی هەموو سەرۆكە كوردەكان و ماڵ و منداڵیان بۆ خۆرهەلاتی ئاناتۆلی دارِشت.

ئالەم كاتەدا دۆستانی برو حسكی تەللو ئەویان ئاگادار كردەوە، كە بڕیار دراوە ئـەویش دوور بخرێتــەوە. ئەمـەش وەلامـی ئـەو بـوو. (باوەڕناكـەم لـە دوای ئـەو هـەموو خزمەتـە گەورەیـە كەپێشكەشــی دەوڵەتی توركم كردووە، ئیتر نازانم دەوڵەتی تورك چ رەخنەیەكیلــە من هەیە). وادێتە بەرچاو كە برو حسكی تەللو نەیدەزانی كـە لـەلای دەوڵـەتی تـورك كـورد هـەر كـوردە. ئیـتر چ خزمـەتگوزار بێــت و چ غەیری خزمەتگوزار.

لە یەكێك لە رۆژەكانی كۆتایی زستانی ساڵی (١٩٢٥) زایینی، لـە كاتێكدا كە ژن و منداڵەكانی برو حسكی تـەللو، لـە مـاڵی خۆیـان لـە دێی (چفتلیك Jefttlek) لە بنـاری چیـای ئـاگری. كـە تـازە لـە خـەو

هەستابوون و خەریکی نان خواردنی بەیانی بوون، لەپڕێکا کۆمەڵێك سەربازی سوارەی تورك، کە بە شوێن برو حسکی تەللودا دەگەڕان لە ئاواییدا دەرکەوتن. ئالەو کاتەدا بوو یەکێك لە پیاوەکانی برو حسکی تەللو کە وایدەزانی ئەم سوارانە بۆ رفاندنی ئەسپی ئاغاکەی هاتوون بە پەلە سواری ئەسپەکە بوو، بەچابووکی بەرەو دێی کوردئاوا هەڵات و دایە غار. سوارەکانی تورك وایان زانی کەئەمە برو حسکی تەللویە هەڵدێت و چەند سوارێکیان دوای کەوتن لەو کاتەدا برو حسکی تەللو لە بایەزید خەریکی نان خواردنی بەیانی بوو. ئەو خۆی بەم شێوەیە بەسەر هاتە کەی بۆ گێڕامەوە: (خەریك بووم لە نان خواردن دەبوومەوە، کە ئێلیخانی کوڕم بە تاوو بە عارەق رشتنەوە لە چفتلیکەوە گەیشتە لام، وتی کۆمەڵێك لە سوارە تورکەکان هاتنە ناو دێ و هاتنە ماڵەوەمان و هەواڵی تۆیان پرسی و بە شوێنتا دەگەڕێن. بە پەلە هاتم بۆ ئێرە تاکو ئاگادارت بکەمەوە. لە دڵەوە خوای گەورە،من لە شارو لە ناوەڕاستی حکوومەتی تورکدام و ئەوان لەدێدا بەشوێنما دەگەڕێن. بە کوڕەکەم وت زوو بگەڕێرەوە و پێیان بڵێ باوکم بۆ قزلدیزە چووە منیش ئێستا لە رێگەی کوتیسەوە ئەڕۆم بۆ چفتلیك و پێویستیم بە تفەنگ و فیشەکەکانمە. دوای رۆیشتنی کوڕەکەم بەپەلە جلەکانم لەبەر کرد. بەرەو شار رۆیشتم. رووم کردە کەعبەو دەستی دووعاو پاڕانەوەم بەرزکردەوە: ئەی خوا. تۆ دەزانی کە چەندە خزمەتی دەوڵەتی تورکم کردووە. هیچ کاتێك لە دژی دەوڵەت کارێکی دوژمنانەم نەکردووە و ئێستاش تورکەکان دەیانەوێت دوورم بخەنەوە. بهێڵە با تفەنگەکەم هەڵبگرم و بەرەو چارەنووسی خۆم بکەومە رێ. هەر

برپیارێکت داوه ئەنجامی بده. کەوتمە رێ و لە کەناری رووبارێك مێگەلەکەی خۆمم بینی کە لە لەوەڕگایەکدا بەکاوەخۆ دەلەوەڕا داوام لە شوانە کەم کرد کە تفەنگەکەم بۆ بهێنێت. پێیان گوتم کە سوارە تورکەکان گەڕاونەتەوە بایەزید، بەڵام یەکێکیان کە بریندار بوو لە ماڵی منیان بەجێ هێشتبوو. بۆ بینینی برینداره‌کە چوومە ناو دێ. داوام لە دوو کەسی کورد کرد کە تاکو بایەزید لەگەڵی بچن).

لە یەکێك لە رۆژەکانی کۆتایی زستاندا بوو. چیای ئاگری کراسە سپییەکەی لەبەر کردبوو. دەتوت کفنی ئەو ژن و منداڵانەیە کە لە بیاباندا سینگی زیوینیان بە نووکی نێزە شەق کراوە. لاشەی زیوینیان ببووە خۆراکی درندەو باڵندەکان.. کە لەخۆی کۆکردبوونەوە و ئەویش لە ژوور هەورە کەڵەکەبووە خۆڵەمێشییەکانەوە تەماشای کوشتارایەکی خوێناویی دووری دەکردو فرمێسکە سپییە درشتەکانی بەسەر زەویدا دەڕژاندن. هاوارە ترسناك و ناڕێکوپێکەکانی. کە لە بەریەککەوتنی بایە توندەکان بە دیواری درزە قووڵ و ترسێنەرەکاندا لە دایك دەبوون و لە گەرووی گیراویەوە دەهاتنە دەرەوە. نەفرەتی لە چەرخی گەردوون دەکرد و جوێنی دەدان.

ئەو رۆژانەی دەهێناوە یادی خۆی کە لەتاو توندیی رق و قینەوە ئاگری لە دەم دەردەپەڕی، پەیکەری ترسێنەری چیاو دەشتەکانی دەهێنایە لەرزین.

| | |
|---|---|
| ئاگـــر دەڕژانـــدە سەر سەران | رووناهی دەرشاندە هەر دەران |
| ئەردی (أرضی را) دەهەژاند جار جاران | هەڵبە ئاگری هەڵبە ئاگری |

ماناى شیعره کان:

ئاگری له سه‌ریه‌وه ده‌ڕژانـــــــد    رووناکی به هه‌موو شوێنێکده‌به‌خشی
جار جارێك ته‌کانی به زه‌وی ده‌دا    هـــه‌ڵـــبه ئاگری هـه‌ڵبه‌ئاگـــری

( له مارشی نه‌ته‌وه‌یی ئاراراته‌وه)

جارێکیـان ده‌نگی چـه‌ند ته‌قـه‌ی تفـه‌نگێك ئـاڵو گۆڕکـران چــه‌ند سوارێکی عه‌سکه‌ری تورك که بۆ گرتنی بـرو حسـکی خزمـه‌تگوزاری ده‌وڵه‌ت(!) هاتبوونه دێی چفتلیك، چونکه به‌رده‌ستیان نه‌کــه‌وتبوو. به شـوێن ده‌سـتوپێوه‌نده‌کانیا ده‌گـه‌ڕان و بـۆ ترسـاندنی خـه‌ڵکیش چـه‌ند ته‌قه‌یـه‌کیان کـرد. ئاراراتییـه‌کان عاده‌تیـان نـه‌بوو، به‌رانبـــه‌ر ته‌قه‌ی نه‌یارانیان بێده‌نگ بن و وه‌ڵامی نه‌ده‌نه‌وه. یه‌که‌مین قوربـانی شه‌ڕ خوێناوییه‌کانی دوایـی سـنوور به‌زێنـه‌کان پێشکه‌شـی باره‌گـای چیای ئاگری، یانکرد. تورکه‌کان له‌وه بێ ئاگابوون که له ئه‌شـکه‌وته قووڵ و شێداره‌کاندا، له درزه تاریك و ترسـێنه‌ره‌کانه‌وه، لـه پشـتی پارچـه سـه‌هۆڵبه‌ندانه‌کانه‌وه، چ گـورگ و شـــێرو چ بـــه‌ورو پلنگێــك خه‌وتوون و بێدارکردنه‌وه‌شیان تا چ ئه‌ندازه‌یه‌ك مه‌ترسیداره.

چیای ئاگری به تافی لاویدا تێپه‌ڕیبوو، وه‌کو ئه‌سپه ره‌سـه‌نه‌کان و به چالاکییه‌کی که‌م وێنه‌وه کـه بـه ده‌نگی تـه‌پڵ ده‌که‌ونـه سـه‌ما کـردن و واده‌زانـن بـۆ غـه‌زا ده‌چـن. ئـه‌م چیـا به‌سـالاچووه، بـــه‌ڵکو ته‌مه‌ن سه‌ده‌ها سـاڵه راوه‌سـتاو بێده‌نـگ لـه‌ماوه‌ی چـه‌ند رۆژێکـدا، داوێنی کراسه سپییه‌که‌ی به‌رزکرده‌وه له باوه‌شی دایکییاو خۆیا. بۆ بـــه‌خێرهاتنی شۆڕشـــگێڕانی گـــه‌وره‌و بێبـــاك، چـــه‌ندین شـــوێنی رازاندبوونـه‌وه. ئـه‌و ئیـتر غـه‌مگین نـه‌بوو چونکـه ده‌یزانـــی تۆڵـــه‌ی

نەوەکانی دەسێنرێتەوە. وەکو خەنجەرێك کە بە سینگی دوژمندا چەقیبێت راست راوەستاو گوێی هەڵخست بۆ ئاوازی شۆڕشگێڕە کوردەکان کە (مارشی میللی ئاراراتیان) دەچڕی ورەو گەورەیی خۆی دوو قات دەهاتەوە بەرچاوی.

دێهاتەکانی دامێنی چیاکە چۆڵ کران. دانیشتووانەکانیشیان لە ئامێزی پڕ لە خۆشەویستیی بەرزاییەکانی چیای ئاگریدا نیشتەجێ بوون. فەرماندەی شاری بایەزید بۆ دەستگیرکردنی برو حسکی دەستی بە فێڵ و تەڵەکەبازی کرد؛ چونکە لە رێگەی وتووێژەوە هیچ ئەنجامێکیان بەدەست نەهێنا. سەربازە تورکەکانیان ناردن و لە بەردەم ئاراراتدا، لەشکریان خست. سەربازگەیان دروستکرد. برو حسکی و سوارە کەمەکانی لە رێگای دوژمندا خۆیان لە مەکۆ نابوو؟ بێ ئاگابوون لەوە کەدوژمن سوود لە تاریکیی شەو، وەردەگرێت. سەربازەکانی تورك شەو لە ئۆردوگاکەیان هاتبوونە دەرەوەو بەپەلە ئەو بەرزاییانەی کە بەسەر شوێنی دانیشتنی پەنابەرەکاندا ئەیانڕوانی، داگیرکردن و لەکاتێکدا کە چراکانی ئۆردوگای چۆڵ و بێ سەرباز هەموویان داگیرسابوون.

هەوا کەم کەم رووناك بووەوە، رووناکیی رۆژو دەنگی تفەنگی دوژمن برو حسکی لەو هەڵەو مەترسییە گەورەیەی کە هاتووتە پێش ئاگادار کردەوە. بەو هێزە کەمەی خۆیەوە، کە بریتیبوون لە دوو براو دوو برازا، دووکوڕ، چەند ئامۆزایەك و چەند خێزانێکی حسە سووری، دەستەی مووسابرکی سا کان و مەحوی بەکرو چەند جەنگاوەرێکی کەسکۆیی رووبەڕووی دوژمن بووەوە.

جەنگ دەستی پێکرد. گرمەی تۆپ و ڕەشاشەکان لە دۆڵ و ئەشکەوتە کانی چیای ئاگریدا، دەنگی دەدایەوە و تا دەهات بە هێزترو ترسێنەرتر دەبوو. ئاگری مەرگی ئەحمەد ئاغای، برای ئازاو دلێری برو حسکی و برای مەحوی بەکری بینی هەروەها برو حسکیش زامداربوو، بەڵام هێزی دوژمن لە بەرانبەر کوڕانی ئازای ئاراراتدا، توانای خۆ ڕاگرتنیان نەبوو. چیای ئاگری، بە چاوی خۆی بینی،کە لە بەرانبەر گەورەیی و ئازایەتیی کوڕەکانیا دوژمن چۆکی دادا. چەك و تەقەمەنییەکانی خۆیان دابەدەستەوە. دووبارە ئاگری بینی کە کوڕە ئازاکانی دوژمنیان تێکشکان و دیلەکانیشیان بەرەڵا کردن، تاکو بە هاوڕێکانیان ڕاگەیەنن: کە کوڕانی ئاگری ئازا. . . . شێرکوژ . . . و جوامێرن. . . . دوژمنی بەهێز زەبوون دەکەن، ئەی کوژن، بەڵام لە دیلەکان خۆش دەبن.

پارێزەرانی ئارارات بۆ یەکەمجار لە بەرانبەر دوژمنی بە هێزیاندا سەریان بڵند کردەوە و چێژی سەرکەوتنیان چەشت. شۆڕشگێڕەکان نەیاندەزانی ئەو تۆپانەی کە لەو جەنگەدا بەدەسکەوت دەستیان کەوتبوو، بەکاریان بهێنن چونکە هیچ کەسێکیان شێوەی بەکارهێنانی تۆپەکانی نەدەزانی. لە ئەنجامدا چەکە قورسەکانی دوژمنیان لە گۆشەو کەنارەکانی چیای ئاراراتدا شاردەوە.

ئەم بەشە گەورەیە بۆ ئەم چیا گەورەیە.

فەرماندەی تورکەکان بۆ پاساودانی نەنگ و شەرمەزاری تێکشکانەکەی. بە هۆی دانیشتووانی باکووری ئاراراتەوە کە هێشتا لە ژێر دەستەڵاتی تورکیەدا بوون،لە شوێنی شاردنەوەی تۆپەکان ئاگادار بوون، بە شەو هێرشێکیان هێناو کۆمەڵێك ئاژەڵ و، چەند

دەوارێك و ئەو تۆپانەش کە بەبێ خـاوەن فرێدرابوون بـە دەستیان هێنـاو بردیانـەوە. پـارێزەرانی ئـارارات، چونکـە درەنـگ لـەم شەوڕەوییەی دوژمن ئاگاداربوون. نەیانتوانی تالآنەکان وەربگرنـەوە. جەنگێکی گرنگیش رووی نەدا.

شۆڕشگێڕانی ئارارات زستانی ساڵی (١٩٢٦) یـان لـە دێهاتـەکانی سەرسینگی چیای ئارارات بە ئیسـراحەت بەسـەربرد. لـەم کەژەیـەدا بوو شەمکی کە یەکێك بوو لە شۆڕشگێڕە خۆبەختکـەرانی نەتـەوەی کـورد، کـە بـەهۆی هەسـتی گیانبـازی و فـام و شـعووروو زات و هەیبەتیەوە، لە نێو هەموو هاوڕێکانیا ناوو ناوبانگ و سـەرکەوتنێکی تایبەتی بۆ خۆی بە دەست هێنابوو، لەگەڵ براکەیدا کـەناوی چرخـە بووهات ئارارات. بەهاری ساڵی (١٩٢٧) هاتە پێشەوە. ئارارات وەکو دایکێك کەمنداڵە بێ باوکەکانی خۆی بـۆ پاراسـتن لـە بـەڵای رۆژگـار لەسـەر سینگی گـەرموگوڕی خـۆی هەڵدەسـوی، بـەرگی سـەوزو گەشـاوەی لەبـەر کردبـوو، دلاوەرەکانیشـی لـە ئـامێزی پـڕ لـە خۆشەویستیی خۆی راگرتبوون.

شێخ عەبدولقادر کە یـەکێك بـوو لـە سـەرۆکە هەییـەت دارەکـانی خێڵی ساکان، لەدامێنی باشووری خۆرئاوای ئارارات نیشتەجێبوو لـە لایەنی دەوڵەتەوە گیرابوو دوور خرابووەوە، بۆ خۆرئـاوای ئاناتۆڵی. لەگەڵ ساڵحی برایا لە ئۆردوگای دوور خراوەکانەوە هەڵاتن و خۆیـان گـەیاندەوە ئـارارات. ژمارەیـەك لـە خێڵـەکانی دانیشـتووی ئـارارات پـەیوەندییان پێوەکـرد. هـەوا گـەرم بـوو. چیاکـان دەیـانتوانی بـە خێرهاتنی میوانەکانیان بکەن. نۆرەی پەلامارو هێرشی ئاراراتییەکان هات.

ڕۆژێکیان بەیانی زوو، دانیشتووانی شاری بایەزید بە دەنگی تفەنگ و قریشکەی گوللەی ئاراراتییەکان لە خەوی ناز بەخەبەرهاتن. بەپێی وتەی تورکەکان، (قاچاخچییەکان) پەلاماری شاریان دابوو. تاکو ئێوارە جەنگ بەردەوام بوو، بەڵام نەیانتوانی شارەکە رزگارکەن. ناچار بەرەو پەناگاکانی خۆیان گەڕانەوە. ئەم رووداوە دەوڵەتی بێدارکردەوەو هێنایەوە سەرخۆ و گرنگیی ئاراراتیپەکانی باشتر روونکردەوە. بۆیە دەوڵەت بڕیاری دا، بە هەر نرخێك بێت کۆتایی بەم جۆرە رووداوانە بهێنێت.

لە کۆتایی هاوینی ساڵی (١٩٢٧) دا بوو، لەشکرێکی تورك نێردرا کە کۆتایی بە جموجووڵی ئاراراتییەکان بهێنێت. ئەم لە شکرە لە هەموو لایەکەوە پەلاماری ئاراراتی‌دا هێزی تورك خاڵە بەرزاییەکانی ئاراراتی داگیر کرد، لەسەر لووتکەی بڵندی ئاگری (لە نێوان ئاگری گەورە و ئاگری بچووکدا) چادریان هەڵدا. ئاراراتییەکان پاڵیان بەسنووری ئێرانی بی‌لایەنەوە داو بەریان بە دوژمن گرت. بەشێك لە جەنگاوەرەکان بە سوود وەرگرتن لە باری جۆگرافیایی خۆیان گەیاندە پشتی هێزەکانی دوژمن، دەستیان بە جەنگ و هەلاتن (پارتیزانی) کرد. نزیکەی بیست رۆژێك بەم شێوەی لێدان و هەڵاتنە هێزی دوژمنیان ماندووکرد. بە شێك لە هێزی تورك کە لە باشوورەوە هاتبووە ناو سنووری ئاراراتەوە و پێش رەوییەکیان بە دەست هێنابوو. ناچار کران بگەڕێنەوە بۆ کۆنە مۆڵگەکانیان. لەم ماوەیەدا ژمارەیەك لە لاوانی کورد بۆ یارمەتیدانی شۆڕشگێڕەکان خۆیان گەیاندە برا ئاراراتییەکانیان.

له دوای پاشەکشێی دوژمن واتە هێزەکـانی لای باشـوور، نـۆرەی سەربازە پیادەکان هات کە لەسەر بەرزاییەکانی بـاکوور سـەنگەریان گرتبوو. هێزەکانی تورك لەم ناوچەیەدا دەستیان بەهێرشـی دڕندانـە کرد– بـەو هیوایـە کـە تۆڵـەی پاشەکشێکەی باشـووریان بکەنـەوە، پێیـان بگەنـەوە– بـۆ بەدەست هێنـانی ئـەم نەخشـەیەیان هـێزی خۆرئاواشیان زیاتر کردبوو.

جەنگ، گـەلێك خوێنـاوی بـوو. پـارێزەرانی ئـارارات لـە بـارێکی گەلێك ترسناکدا بوون. هەوا ئاڵوگۆڕیکرد. باران بە خوڕەم دەباری، پەردەیـەکی تـاریك لەتـەم کـە رووی چیاکـەی داپۆشـی بـوو، ئـەم کوشتارگا دەردناك و دڵبریندارکەرەی شاردەوە. ئارارات بە یارمەتیی کوڕەکـانی هەڵسـابووە سـەرپێ. شۆڕشـگێڕەکان ئـەم هەلـەیان لەدەست نـەدا، پـەلامارێکی دلێرانـەیان بـرد. لـەکاتێکدا کـە تـەم رەوییـەوە ئـارارات رووناك بـووەوە. هێزەکـانی تـورك تێکشـکێنران شۆڕشـگێڕەکان دەسـتیان بـە چـەك دامـاڵینی تـورك کـرد، بـەڵام گرنگییان بە دیل گرتن نەدەدا، هەرچەندە لەناو دیلەکانیشـدا بیسـت و سێ ئەفسەری تورکی تێدابوو، کە لە دوای بیست و چـوار کـاتژمێر ئازادکران. لەم جەنگـەدا چـەك و تەقەمەنییـەکی زۆر کەوتـە دەست ئاراراتییەکان.

کاریگەریی ئەم جەنگە، لە ناوچەی شۆڕشگێڕەکانی ئـاراراتدا بـە روونی دەردەکەوت. ئەتوت گۆرانییـەکی غـەیبی هـاواری لـە ئـارارات دەکردو ئەیوت:

نەوالێن تە تژی خـــــــوونبوو. خــــــلخلـــە تژی جەندە کبوو

راستە بەرێ ئاگری تۆبــــــوو ئیـــمرۆ ئاگــــر لاوانـی تۆ بوو

**ماناكەی:**

دۆڵەكانی تۆ پــــڕخوێــــنبوو  دررزی بەردەكان پڕ لە لاشە بوو

راستە تۆ لە كۆنا ئاگربــــووی  ئەمـــڕۆكــە لاوەكانی تۆ ئاگرن

هێشتا یەكە تێكشكاوەكانی سوپا، ئاراراتیان بەجێ نەهێشــتبوو. كە فـەرماندار‌ی تـورك، ئاگـاداربوو كـــە ئیحســـان نوریــش لـــە نـــاو جەنگاوەرەكانی ئاراراتدایە. (ئەم ئەفسەرە لە كۆتایی ساڵی (١٩١٩) نوێنــەری كۆمەڵــەی ئەفســەرانی ئەســتەموولْ بــوو. نــاوبراو( واتـــە: ئیحسـان نـوری ) لەگـەڵ حكوومـەتی فـەرید پاشـا كـە لـە بەرانبــەر شۆڕشی ئاناتۆڵی راوەستابوو، دوژمنایەتی هەبوو. ئیحسان نوری بـە پشتیوانی ئەفسەرەكانی ناو كۆمەڵەكەی و هـەروەها بـە موافەقـەتی كەمالەدین نوێنەری مستەفا كەمال پاشا. كە لە دواییدا بە ئــەتاتورك ناسرا چەكی هەڵگرت و بەیارمەتیی فەوجی پیادە حكوومەتی فــەرید پاشـای سـەرنگوونكرد. لـەدوای ئـەوە حكوومـەتی عـەلی رەزا پاشــا لایەنگیری لەو راپەڕینە  كـرد كـە مسـتەفا كـەمال پاشـا رابەرایـەتیی دەكـرد. لـەم كاتــەدا ئیحسـان نـوری وازی لـە هــــەموو چالاكییــەكی شۆڕشگێڕانەی هێنابوو. حكوومەتی كاتی ئاناتۆڵی داوای لە ناوبراو و چەند ئەفسەرێكی نەتەوەیی كرد كە بۆ هێنانی سوپای سوور بۆسەر قەڵـەمڕەوی توركیــە و دابینكردنــی كۆمــەكی شـــوورەوی بـــۆ هـــێزە نەتەوەییەكانی تورك بچن بۆ باكۆ.

كۆماری نوێی توركیە  لـەدوای سـەقامگیربوونی، ئیـتر گوێـی بـەو بـەڵێن و پەیمانانـەی كەبـە كـوردی دابـوو. نـــەدا و ئیحســـان نـــوری پەیوەندیی بە كۆمیتەی كوردستانی سەربەخۆوە كرد. ئەم كۆمیتەیە كەلە ژێــر سـەركردایەتیی خـالید بـەگی جـبرانی–ی سـەرۆكی خێڵـی

جبران دروست بوو، ماوەیەك لەوەو پێش چالاكییە نهێنییەكانی خۆی لە ئەرزەڕۆمدا پیادە كردبوو. لە (١٩٢٤) دا كۆمیتەی كوردستانی سەربەخۆ، فەرمانی بە ئیحسان نوری كە ئەفسەرێكی لاو بوو، لەگەڵ ئەفسەرانی كوردی وەكو راسم بەگی وانلی، تۆفیق بەگی مێردینی، خورشید بەگی هەرتوشی، عەلی ڕەزا بەگی بەدلیسی، كە هاوڕێی ناوبراو بوون، كە بۆ دروستبوونی كوردستانی سەربەخۆ دەست بە شۆڕش بكەن، بەڵام ئەم شۆڕشە سەركوت كرا.

ئیحسان نوری لە ئەفسەرە كوردەكانی توركیە بوو. پێنج ساڵ لەپێش ئەمڕۆداو لە شاری بایەزید فەرماندەی هێزی سەر سنووری توركیە–ئێران بوو، لە ماوەی فەرماندەییەكەیدا ئاگادارییەكی سەبارەت بە ناوچەكە پەیدا كردبوو.

ئەم كەسایەتییە كە سەردەمێك لە ناوچەی بایەزید پارێزەری مافی دەوڵەتی توركیە بوو، ئێستا لە ڕیزی شۆڕشگێڕەكاندایە و پارێزەری مافی كوردەو لە ئارارات نیشتەجێیە و داوای نەمانی دەستەڵاتی توركیە لە هەموو كوردستانا دەكات. بە رابوردوویەكی ئازایانەو دلێرانەو كارزانییەوە كە ئەم ئەفسەرە لەماوەی خزمەتكردنی لەناو سوپای توركدا ئەنجامی دابوو. بەو ئاگادارییەی كە فەرماندەی سوپای تورك لە بارەی رادەی نیشتمان پەروەری و میللییەتیی ناوبراوەوە هەیبوو، هەواڵی بوونی ئەو لە ناو شۆڕشگێڕەكانی ئاراراتدا. بەتایبەتی لەم كاتەدا كاریگەرییەكی بێ ئەندازەی هەبوو.

لەدوای ئەوەی كە هێزەكانی تورك لە ئارارات دەركران. ناوبراو چەند بنكەیەكی سەربازی كوردیی لە شۆڕشگێڕەكان پێكهێنا و

ئالآی کوردستانی ئازادی لەسەر بنکەکان هەڵکرد. لەم کاتەدا ئـاگری نـەك بـە تەنـها خـاوەنی ڕێکخسـتنێکی سـەربازی بـوو، بـەڵکو ڕێکخراوەکـانی بەڕێوەبردنیشـی هێنـابووە بەرهـەم. بـەم شـێوەیە بەشی باشووری ئارارات کە بـەهۆی ئـەم ڕێکخستنانەوە کەوتـە ژێـر دەسـتەڵاتی کـوردەوە، بـوو بـە نـاوەندی خۆبەختکـەرانی نەتـەوەی کورد.

با، ئالآی ئازادیی دەشەکاندەوە. نەتەوە پەروەرانی کـورد، بەم سـەرکەوتنە مەزنـە شـادمان بـوون، بـە دەنگێـك، کـە لـە شـادی و غروورەوە چیاکـانی هێنـابووە لـەرزین، سـروودی نەتـەوەیی خۆیـان دەخوێندەوەو ئەیانوت.

| | |
|---|---|
| شەرق و غەرب باسك و گرتی پی | سەر سینگ خو لاو گرتی پی |
| کوردان را تـو کعـبە بـوی | هەڵبـە ئـاگری هەڵبـە ئاگـری |

مانای شیعرەکە:

باوەشت بۆ خۆرهەڵات و خۆرئاوا کردوەتەوە

سەرسینگ حولاو گرتی پی

بووی بە کەعبە بـۆ کـوردەکان

هـەڵبە ئاگـری. هەڵبە ئاگری...

دێهاتـەکانی دامێنـی چیاکـە دووبـارە بـە دەسـت و بـازووی ئاراراتییەکان ئاوەدان کرانەوە. ئەو ئـاوەی کـە لـە نـاو قامیشـەڵانی خۆرئاوای چیاکەوە سـەرچاوەی دەگـرت و لـە باشـووری ئاراراتـەوە بـەرەو خـاکی ئـێران دەڕۆیشـت بـوو بـە سـنووری سروشـتیی ڕێکخستنەکانی نێوان ئاگری– تورکیە.

ئـەم جەنگانـەی ئارارات هاوکاتبوون لەگـەڵ بەسـتنی کۆنگـرەی نەتـەوەیی کـورد. کـە لـە سـەرۆکەکان و رۆشـنبیران و نوێنـەرەکانی کـورد پێکهاتبوو. ئـەم کۆنگرەیـە لـــە ئـەنجامی وتووێــژی خــودی کۆمیتەیـەك بـە نـاوی (خۆیبـوون) لـە دایـك بــوو. ئیحســان نــوری، بەســـەرکردەی هــێزی چـــەکداری ئـــەم کۆمیتەیـــە هـــەڵبژێردرا و بـەڕێوەبردنی بزووتنـــەوەی نەتـــەوە پـــەروەرانی کوردســـتانی پـــێ سپێردرا.

ڕێگـای قارەمانـانی کـورد بـۆ ئـــارارات کرابـــووەوە. لــە هـــەموو لایەکەوە بەپەلە بۆی دەچوون. فەرزندە بەگی هەسنی، کـە لـەکاتی شۆڕشەکەی شێخ سەعید شاری مەلەزگری رزگارکردبوو و هێزەکانی تورکیای چەك کردبوو. لەگەڵ کازم بەگی برایو ئامۆزایەکی و چـەند سوارێك هاتنە ئارارات.

خـالس بـەگی کـوڕی عەبدولمـــەجید ســـەرۆکی خێڵـــی ســـپکی و تاجەدین بەگ کە یەکێك بوو لە سەرۆکەکانی، زرکی عەدوی عـــەزیزی حەیدەری سەرۆکی ژمارەیەك لـە خۆبەختکـەرانی کـورد، ئەحمـەدی حـاجی بـرو حـــەیدەری و براکـــانی، زانـــاو گـــەورەی رێـــزدار ســـەید عەبدولوەهاب ئە فەندی و کوڕە مامەکەشی و سەید رەسووڵ کـە لـە ئۆردوگای دوور خراوەکانەوە. لە (ئەزمیر)ەوە رایان کردبوو. یەك لــە دوای یەك گەیشتنە ئارارات.

بـرو حسـکی بـە فـەرماندەری و تەمـەر شـەمکی بـە فـــەرماندەی ئاسایشی ئارارات هەڵبژێردران.

لەم کاتەدا بوو کە نەتـەوە پـەروەرانی کـورد مارشـی ئاراراتیـان بـە خۆشی و شادمانییەوە دەچڕی و ئەیانوت:

ئیمڕۆ دیسا حرص تۆ هـــات ئەو ئاگـــــــران ونە کلات
کۆمبون ئەدی سەرتە جوات هەڵبــە ئــاگـــــری، هەڵبـە ئاگری

مـــــاناکەی :

ئەمڕۆکە تۆ دووبارە تووڕەبویت ئاگرەکانی تۆ بوون بە قەڵا
کۆمەڵ لەسەر تـــــۆ پێکهاتووە هە ڵبە ئاگری، هەڵبە ئاگری

ئەیوب ئاغا کە یە کێك بوو لە سـەرۆکەکانی قوتـان لەگـەڵ چـەند کەسایەتییەکی خۆ یاندا. کە لە بەشی سەر سینگی باکووری ئارارات لە شاری دێرینــی قۆرخـان، خۆیـان قـایم کردبـوو، سـەربازانی تـورك پەلاماریان دان. جەنگێکی قورس وسەخت رووی دا. سوپای تورك لە پاش کوژرانی ژمارەیەك سەرباز و ژمارەیــەك دیـل و بریـندار، بـەرەو شـاری ئیغدیـر پاشەکشـێیان کـرد. ئـەیوب ئاغـاش خـــۆی گـەیاندە هێزەکانی ئارارات و پەیوەندیی پێوە کردن.

بڕشت و رێکخستنی ئاگری، زیاتربوو پەرەی سـەند. بەشـێوەیەك کە دانیشتووانی شاری بایـەزید کـە دەیانویسـت لـەو قامیشـەڵانانەی دەوروبـەری شـــار بـــۆ ســـووتاندن ســـوود وەربگـــرن، دەبوایـــە رێکخراوەکانی ئاراراتیان رازی کردایە و مۆڵـەت وەر بگرن. ئەوانە بە وەرگرتنـی مۆڵـــەتی رەسمــی ج بــە ج-ی ئـارارات بـە بـێ رێگـر هاتوچۆیـان دەکـرد. حکوومـــەتی بایـەزیدیش لـە بەرانبـەر ئـــەم هەنگاوەدا جگە لە چاوپۆشی هیچ چارەیەکی دیکەی نەبوو.

دەوڵەتی تورکیە، چونکە لە رێگەی هێزی سەربازییەوە، نەیتوانی کارەکەی بەرەو پێشەوە ببات. بۆ تێکدانـی ئـەم نـاوەندە نەتەوییـە

کوردییە لە ئاراراتدا، بیریکردەوە یاسایەکی بە ناوی (یاسای دواخستن) (یاسای تأجیل)ەوە لە ئەنجومەنی گەورەی نەتەوەیی تورکیەوە دەرکرد و بەپێی ئەو یاسایە لێبوردنێکی بێبەندو مەرج کە تەنها ویلایەتەکانی کوردستانی دەگرتەوە، راگەیاند. بەهۆی چەند دەستەیەکەوە لە کەسایەتییەکانی ناوچەکان ئەم یاسایەی گەیاندە ئاراراتییەکان بانگی ئاراراتییەکانیان دەکرد، بێنەوەو ملکەچی دەوڵەت بن و سوود لەم یاسایە وەربگرن.

لە بەرانبەر راگەیاندنی ئەم یاسایەی دەوڵەت ئاراراتییەکان رایانگەیاند، لەکاتێکدا راگەیاندنەکانی نوێنەرە نێردراوەکانی دەوڵەت پشتی پێدەبەسرێت، کە سەرۆك و رووناکبیرە کوردە دوور خراوەکان ئازاد بکرێن، بگەڕێنەوە ناو ماڵو منداڵی خۆیان. دەوڵەتی تورکیش ئەم پێشنیارەی پەسەند کرد، بێجگە لە چەند کەسێك نەبێت، هەموو دوورخراوەکان ئازاد کران. ئەم دەستانە لەلایەنی دەوڵەتەوە، بێجگە لە بانگەشە لە ناو نەتەوە پەروەرانی ئاراراتدا ئەو ئەرکەشیان پێسپێردرابوو، کە بە ئیحسان نوری و شێخ عەبدولقادر کە بنەماڵەکانیان بۆ خۆرئاوای ئاناتۆڵی گوێزرابوونەوە، گفتوگۆ بکەن، پەیمانیان پێبدەن کە لە حاڵەتی خۆبەدەستەوەداندا. دەوڵەت گەڕاندنەوەی بنەماڵەکانیان پەسەند ئەکات.

ئەم پێشنیارانەی دەوڵەت و وتووێژی دەستە نێردراوەکان کاریان لە ئیحسان نوری نەکرد، بەلام شێخ عەبدولقادر لەگەڵ دەست وپێوەندەکانیا چوون بۆ شاری بایەزیدو خۆیان دا بەدەستەوە. شێخ عەبدولقادر لەدوای خۆبەدەستەوەدانەکەی لەگەڵ دەستەیەکی دیکەدا راسپێردراو هات بۆ ئارارات تاکو بە ئامۆژگاریی دۆستانە والە

بـرو حسـكى بكـات، كـه بگەڕێتـەوەو ملكـەچى ياسـاكە بێـت، بـەلاّم ئاراراتييەكان كەلەم نيازە ئاگادار بوون، ڕێگەيان پێنـەدا. ژمارەيـەك لەو كەسانە كە لە دەرەوە هاتبوونە ئاراراتەوە كەوتنـە شـوێن شـێخ عەبدولقادر. خۆيان دا بە دەستى دەوڵەتى توركيەوە.

دەوڵەت هانى خۆبەدەستەوەدەرانى دەدا، بەم شێوەيە كـە نـەك هـەرگيز چـەكيان ناكـات، بـەڵكو لەبەرانبـەر ئـەم ملكـەچى و خۆبەدەسـتەوەدانەدا خەلاّتيشـيان دەكـات. لـە نـاو خۆبەدەستەوەدەراندا. سـەيد عـەبدولوەهاب و تەمـەر شەمكيشـى تێدابـوو، كـە بـە فـەرمانى فـەرماندەى نەتـەوە پـارێزانى كـورد چووبوونـەوەو ملكـەچى دەوڵـەت بووبـوون، گوايـە نەخشـەى فـەرماندەى كوردەكـان ئـەوەبوو. كـە ڕێكخسـتنى خۆيبـوون لەناوچەكانى ديكەى كوردستانى توركيەدا فراوانتر ببێتەوە. بـۆ ئـەم مەبەستەش نەخشـەى بـە رواڵـەت خۆبەدەسـتەوەدانى ئـەم دوو كەسايەتييە زەروور بوو.

نيشتمان پەروەرى لە ناو هەندێك لە سەرۆكەكانى نەتەوەى كورد ئەوەندە بە هێزبوو، كـە خۆبەدەستەوەدانيان بـە كوفـر دەزانـى بـە هيـچ شـێوەيەك بـۆ بيسـتن و باسـكردنى، ياسـاى دواخسـتن ئامـادە نەبوون. لەم كاتەدا بوو كە فەرماندەى شۆڕشـگێڕانى كـورد ديـدارى نوێنەرى رەسميى كۆميتەى ئەرمەنييـە كۆچەرييـەكانى لـە ئـاراراتدا پەسـەند كـرد، چونكـە كۆنگـرەى كـورد نيـازو خواسـتى ئەرمەنييـە كۆچەرييەكانى بە دۆستايەتى نێوان كوردو ئەرمەنى دادەنا. هـەندێك كـەس ديـدارى فـەرماندەى كـوردى لەگـەڵ تاكـە نوێنـەرێكى ئەرمەنييەكانيان بەهۆيەكى راگەياندن دەزانى. بە پێچەوانەى واقـع و

راستی، بەم جۆرە بانگەشەیانکردبوو، کە هێزی چەکداری ئەرمەنییەکان بۆ یارمەتیدانی کورد هاتوون.

راپەڕاندنی یاسای دواخستن بۆ ماوەیەکی کەم، هێزەکانی ئاراراتی لەرووی خواربارەوە تەنگەتاو کرد. زستان بوو. بەفر ناوچەی بایەزیدی تانزیکی شۆرشگێڕەکانی ئاگری داپۆشیبوو. بەهاری ساڵی (١٩٢٨) هاتە پێشەوە. هێشتا بەفر لەم ناوچەیەدا مابوو، بەڵام لە هەمان کاتدا، بەفر لە دامێنی چیای ئاراراتدا تواببووەوە. گیای سەوزو پاراو، دامێنی چیاکەی داپۆشیبوو. نەبوونی ئالف لە ناوچەی بایەزیددا بوو بەهۆی زیانێکی گەلێك گەورەی لە ئاژەڵەکانی ئەم ناوچەیەدا، بەشێوەیەك کە خێڵەکانی دەوروپشتی بایەزید ناچار بوون بە مۆڵەت و موافەقەی دەوڵەت لەگەڵ رێکخراوەکانی ئاگریدا، سەبارەت بە لەوەڕاندنی ئاژەڵەکانیان گفتوگۆ بکەن، تاکو ئاژەڵەکانیان بەرن بۆ چیای ئارارات، سەختیی ژیانی مللیگەرایانی کورد بەرزتربوو بووەوە. ئەتوت پەروەردگار بۆ پاداشتی خۆڕاگرتنیان و ورەی بەرزی شۆڕشگێڕەکان بەم شێوەیە یارمەتیی بۆ ناردبوون.

ژمارەی شۆڕشگێڕەکانی ئارارت کەم بوو و لە دۆخێکی مەترسیداریشدابوون. فەرماندەی شۆڕشگێڕەکان، ناچار بوو بە هەر شێوەیەك بێت خۆی بەقەویترو بەهێزتر نیشان بدات. لە هەمانکاتیشدا نارەزایی خۆشی بەرانبەر بە یاسای دوا خستنیش، روون بکاتەوە. لە بەر ئەمە لە لایەکەوە خالس بەگیان لەگەڵ ژمارەیەك سوارەو پیادە و لەلایەکی دیکەشەوە فەرزندە بەگ و

سوارەکانی فەرمانیان پێدرا، کە بچنە نێو خاکی تورکیەوە و بە هێرش و پەلامارەکانیان، نا ئارامی پێکبهێنن.

لە کاتێکدا کە تورکەکان وایان دەزانی کۆتاییان بە باری ئارارات هێناوە، دەستەکەی خالس بەگ، (٣٠٠) سەربازی لە خاکی تورکیەدا دەستگیر کردبوو و دیدە بانەکانیان چەککردبوو. چالاکییە بێ وێنەکەی فەرزندە بەگ و دەستەی عەدوی عەزیزی و دەستە بچووکەکانی دیکە کە راستەوخۆ لە ئاراراتەوە هاتبوون، رێگا نزیکەکانیان کۆنترۆڵ دەکردو بە پەلەش دەگەرانەوە دواوە. توانا و چالاکییە هەمیشەییەکانی هێزەکانی ئاراراتیان لەبەر چاودا گەورەو بەر جەستە دەکرد، جارێکی تر حکوومەتیان لە هەڵە گەورەکەی بە ئاگا هێناوە.

هاوین هاتە پێشەوە. کات بۆ راپەراندنی چالاکییەکان لەبارتر بوو. شێخ عەبدولقادرو یاوەرەکانی، چوون بۆ کوێستانی دێرینی خۆیان، کە چیای سینگ بوو لەناو خاکی تورکیەدا بوو و لە ئاراراتیشەوە دوور بوو. چالاکیی دەستەکانی ئارارات لە ناو خاکی تورکیەدا رۆژبەرۆژ بەهێزترو گورچکبرتر دەبوو. زۆربەی ئەم دەستانە تاکو مەودایەکی دوورو درێژ لەناو خاکی تورکدا دەچوونە پێش. بۆ نموونە: دەستەی فەرزندە بەگ هێرشەکانی خۆیان تانزیك (حەسەن قەڵا) لە نزیکی ئەرزەرۆم درێژە پێدەدا. لە هێرشێکیاندا کاروان سەرایەکیان لە نێوان حەسەن قەڵاو ساری قامیش بە مەبەستی رێگەگرتن لە هاتوچۆی داگیرکەران، داگیر کرد، ژمارەیەك لە ئەفسەرانی تورك کە بەوێدا تێدەپەرین،- بە دیل گرت، چونکە ئەم ئەفسەرانە لەگەڵ بنەماڵەکانی خۆیاندا هاتبوون، بۆ رێزگرتن لە

ژنەکانیان کە لەگەڵیاندابوون لەلایەنی دەستەی فەرزندە بەگەوە ئازاد کران.

دەستەی عەلۆ بەشۆ تادەروازەی ئەرزەڕۆم دەچوونە پێش. ئەم دەستەیە لە ناوچەی پالان توکن ژمارەیەك لە سەربازانی تورك کە تاقیب کردنی شۆڕشگێڕەکانیان پێسپێردرابوو، خستە نێو داوی خۆیانەوە، لە ئەنجامی جەنگێکی کورتا ئەفسەرێك و چەند سەربازێك کوژران و چەکەکانیان دەسکەوتبوو، گەڕانەوە.

تەللو لە گەورە پیاوانی مەلەزگر. لەگەڵ هاوڕێکەیدا چاوش و ژمارەیەك لە شۆڕشگێڕەکان تا ناوچەی مووش ڕۆیشتن، لە چوارچێوەی ئەنجامدانی ئەرکەکانیاندا، پەیوەندیی هێزەکانی ئاراراتیان بە دەستە شۆڕشگێڕەکانی ناوچە جۆر بە جۆرەکانەوە پێکدەهێنا.

سەرەڕای ئەم جۆرە چالاکییانە، هێزی شۆڕشگێڕی کورد لە هەموو بەشەکانی دیکەی کوردستان دەستیان بە چالاکی کردبوو، بەڵام چونکە ئێمە مەبەستمان تەنها نووسینەوەی چالاکییەکانی ناوچەی ئاراراتە بە کورتی، لە باسکردنی چالاکییەکانی ناوچەکانی دیکەی کوردستان خۆمان دەپارێزین.

لە ناوچەی مەدیات لە نزیکی سووریە، یاوەرانی حاجو ئاغای سەرۆکی خێڵی هەڤێرك. لە ناوچەی ماردین و نسێبین و هەروەها ئەو ناوچەیە کە تا شەرنەخ و ئورە و هەکاری درێژ بووبووەوە، دەخستە ژێر هەڕەشەو گەفی خۆیەوە.

ڕۆژنامەیەك بە ناوی (گێجە پۆستاسی) کە لە ئەستەموول دەردەچوو، لە ڕۆژی (٩ ی سپتامبەری ١٩٤٧) زنجیرەیەك وتاری بە

ناوی (شۆڕشی گەورەی ئاگری و ئەنجامەکانی) بە پێنووسی زوهـدی گویڤـەن بلاوکـردەوە. نووسـەر لـەو ئەفسـەرانە بـوو کـە لـــە سـالّی (١٩٢٩) گوازتیانـەوە بـۆ فـەوجی گـەڕۆك و خـودی خـۆی لـە چـەند نەبـەردێکدا لـە دژی کـورد بەشـداریی کردبـوو. نووسـەر لـــە مـانگی حوزەیرانی (١٩٢٩) دا لە گموشخانەوە بۆ تەرابوزان رۆیشت. نـاوبراو نووسیویە: دەرچوون لە تەرابوزان کارێکی ئاسان نەبوو ((چونکە لـە کاتێکدا کە یەك ئاژووەر (شۆفێر)ی تەرابوزانی کـە نـاوی ئیچدیریـان کـە (شـارێکە لـە بـاکووری ئـاگری لـە نزیـك سـنووری ئەرمەنسـتانی شووروەوی) دەبیسـت، رووی وەردەگـێڕا و دەیگـوت تـاکو ئـەرزەڕۆم دەڕۆم، هەرگیز دوورتر ناڕۆم. چونکە هەرچەندە بەرەو باکوور بڕۆین لە ناوچەیەکەوە نزیك دەبینەوە کە لە ژێر کۆنترۆڵی رێگرەکاندایە)). لەم سالّەدا سوپای تورکیـە لـە خۆرهـەلاّتدا چـالاکیی خـۆی لـە دژی شۆڕشگێڕەکانی ئاگری دەسـت پێکردبـوو. ئێمـەش بـۆ گەیشـتن بـە ناوچەکانی جـەنگ بـەڕێوە بووین. لـەدوای چـەند رۆژێـك راوەسـتان لەبـەر نـەبوونی ئـاژووەرێك لـە تـەرابوزاندا ماینـــەوە، لـە ئــەنجامدا توانیمـان ئـاژووەرێك پەیداکـەین کـە لـەوەو پێشـــتریش دەمناســی. لـەدوای ماوەیـەك چەنـەدان ئامـادەبوو کـە بمانبـات بـۆ ئـــەرزەڕۆم. ناوبراو لە کاتی رۆیشتنەکەماندا، بیرەوەری و گفتوگۆکانی بێجگە لـە گێڕانەوەی چـالاکیی شۆڕشـگێڕەکان هیچـی دیکـەی پێنـەبوو. بـۆی گێڕاینـەوە جارێکیـان یـــەکێك کرابـــوو بـــە شـــەهرداری شـــارێك لـــە شارەکانی خۆرهـــەلاّت دەبوایـە بـۆ دەسـت بـە کـارکردنی بـڕوات بـۆ شارەکە. لە کاتێکدا کـە لـە کۆیـپ بـاغ–Kopbagh (کـە لـە نیـوەی رێگای بابیورد و ئەرزەڕۆم) دایە. تێدەپەڕین، چوار کـوردی چـەکدار

دەرکـەوتن و پــەلاماری ئۆتۆمبیلەکــەیان دا. چــەکدارەکان هــەموو دراوی سەرنشینەکانیان بردو لە نێوان خۆیانا بەشیانکرد. (چەتەکان لە ناو خۆیانا ئەیانوت): حەسۆ ئەمە بەشی تۆ، ئەمەش بەشی ئێمە، ئەوەش بۆ ماڵەوەو ئەمەش بۆ لـە ڕێگـەی خـوا. . . . . ئێمـە چەتـە نـین. ئێمــە تەنـها ئـەوەی کــە پێویسـتمانبێت، هـەڵی دەگریـن. باقیەکەشی بۆتان دەگێڕینەوە. خوا حافین، خواتان لەگەڵ.

ئاژووەرەکە دەستی بە چیرۆکێکی دیکە کـرد: لـە گۆیـب داغ دوو کەسـی چــەکدار کــە چــاودێری شــەقامەکە بــوون ئۆتۆمبیلەکــەی زوهدییان راوەسـتان پێیـان وت ئاگـادار کراویـن کـە گرووپێکـی چـل کەسی، نیازیان وایە لە دەرسیمەوە بێن و ئێمە نازانین ئالەم کاتـەدا گەیشتوونەتە کوێ. بە دوایاندا دەگەڕێین. (دەرسـیم ناوچەیەکـە لـە نێوان خەرپوت و ئەرزنجاندا، تورکەکان ناوە کوردییەکەیان گۆڕیـوە کردوویانە بە تانسلی).

لە ئەنجامدا بە ترس و لەرز گەیشتینە ئەرزەڕۆم. ئاژووەرەکە کە دەبووا ڕێبوارەکان تــا ئیگدیـر ببـات، هـەڵچوو. نـاوبراو هـەواڵێك کـە سەبارەت بە کوردەکان بیستبووی بۆی گێڕاینەوە وتی: (من نــاتوانم لە ئەرزەڕۆم زیاتر بڕۆم. ئێـوە هـەوڵبدەن هۆیـەك بـۆ خۆتـان دابـین کەن. من دەگەڕێمەوە بۆ ئەو شوێنەی کە لێوەی هاتووم).

ئەمە چەند وشەیەکە کە ئەفســەرێکی تـورك لـە بـارەی رەفتـاری کوردەکانــەوە لــەکاتی چــالاکی لــە دەرەوەی ســنووری ناوچــەی چالاکییەکانی ئاگری نوسیوویەتی.

دەستە ناوچەییــەکان کـە لەلایـەن فـەرماندەی کوردەکانـەوە بـۆ ئـەنجامدانی کاروبـاری شـۆڕش رەوانـە کرابـوون، لـە لایــەن کــوردە

دانیشتووانەکانی ژێر دەستەڵاتی دوژمنەوە بـە شـێوەیەکی شایسـتە پێشوازییان لێدەکرا. لەبەر ئەمە شۆڕشگێڕەکان لە کاتی راپەڕاندنی ئەرکەکانیان هیچ پێویستیان بە هەڵگرتنی خواربار نەبوو، کە لەگـەڵ خۆیانا بیگێڕن. لە گەشتێکی شۆڕشگێڕەکاندا دەسـتەیەکیان چـوون بۆ دەوروبەری ئەرجیش و بەڕێکەوت لەلایەن هەندێك ئاژەڵدارەوە کە لەو نزیکانەدا بوون، پێشوازییان لێنەکرا تەنانەت لە بەخشینی چەند سـەرمەڕێك بـۆ خـەرجیی شۆڕشـگێڕەکان، پێدزکێیـان کردبـوو بـۆ تەمێکردنی ئەم خاوەن ئاژەڵانە دەستەکانی فەرزندە بەگ و خـالس بەگ و مەمەدی عەزیز نێردران، تاکو هەموو مەڕەکانیان کە لە هەزار سـەر مـەڕ زیـاتربوو، دەسـتیان بـە سـەرا بگـرن و بـەرەو ئـارارات رەوانەیان بکەن. ئەم کارە بەم شێوەیە راپەڕێنرا. خاوەن مـەڕەکان لای دەوڵەت شکاتیان کرد، تەنانەت بروسکەیەکیان بەم شـێوەیە بـۆ دەوڵەت رەوانە کرد: (ئەگەر دەوڵەت ناتوانێت ئێمە لە دەسـتدرێژیی یاخی بووەکانی کورد بپارێزێت واباشە ناوچەکە بەوان بسپێرێت تاکو بۆ خەڵکی روون و ئاشکرا بێـت). رووداو یـەك لـە دوای یـەك دەهاتـە پێـش بـە شـێوەیەك بـوو کـە رووداوی مـەڕەکان، فـەرامۆش کـرا. دەوڵەتی تورکیـە وای بەباشـزانی کـە دەسـتەیەك بـە دەسـتەڵاتێکی تەواو لە ناوەندی دەوڵەتەوە بۆ ئارارات رەوانە بکات. ئەندامانی ئەم دەستەیە بریتیبوون لە دوو نوێنەری ئەنجومەنی گەورەی تورکیە کە یەکێکیان نوێنەری ئەستەمووڵ و ئەوی تریان نوێنەری شاری بایەزید بوو، لەگەڵ فەرماندەی لەشکری قەرەکۆسـە و پارێزگـاری بایـەزید و چەند ئەفسەرێکی گەورەی سوپا. لەناو ئەم دەسـتەیەدا فـەرماندەی

ئاسایشی شاری بایەزید، عارف حکمەت بەگی تێدا بوو ناردنیە لای سەرۆکی کوردەکان و داوای چاو پێکەوتنیان کرد.

ڕۆژی دوایی لە پشت هێڵی سنووری نێوان ئارارات و تورکیە چاوپێکەوتنەکە پێکهات. فەرماندەی کورد و سەرکردەکانی ئارارات و ژمارەیەك سوارکە لە ورەو ئازایەتیدا لە کلّی ڕۆژگار دەرچوو بوون، لەگەڵیاندابوون. داخوازییەکانی ئەم دەستە نێردراوە بریتیبوون لە یەکەم ئارام بوونەوەی ئاراراتییەکان و خۆدوورگرتن لە زوڵم و هەڕەشە، دووهەم چوونە دەرەوەی ئیحسان نوری لە ئارارات.

لەگەڵ کۆڵێك پێشنیاری دەستەی نێردراو، بەڵام ئەم داخوازییانە ئەنجام نەدران چونکە ئیحسان نوری هەموو پێشنیارەکانیانی ڕەدکردەوە، چونکە حەزی نەدەکرد بۆسوود وەرگرتن لەو ماف و ئیمتیازانەی لەوەو پێشی خۆی بگەڕێتەوە بۆ تورکیە، نە قبووڵیشیکرد کە لەلایەن دەوڵەتەوە بە فەرمانبەری بۆ یەکێك لە وڵاتەکانی دەرەوە ڕەوانە بکرێت و نەئامادەش بوو. لەلایەنی دەوڵەتەوە پەساپۆرتی پێبدرێت. کە هەر شوێنێکی بە دڵبێت بەبێ تەنگ و چەڵەمە بۆی بڕوات. تەنها ئەنجامێك کە لەم دیدارو گفتوگۆیەدا دەستکەوت پەیمانی جەنگ راوەستانی سەرزارەکی بوو، کە ئاراراتییەکان فشار بۆ ناوچەی بایەزید نەهێنن و دەوڵەتی تورکیەش وازبێنێت لە ناردنی هێزو ناڕەحەتکردنی ئاراراتییەکان.

لە بەرانبەر داواکانی دەوڵەتدا کوردەکان هیچ داوایەکیان نەبوو کە دەوڵەتی تورکیە پێی نەزانیبێت. شەکانەوەی ئاڵای سێ ڕەنگی کوردستانی ئازاد بەسەر لووتکەکانی ئارارات و چیاکانی جزیرەو

بۆتان و مەدیات و ساسون و غەرزان و شوێنەکانی دیکەی کوردستان باشترین و ئاشکراترین ئاواتی کوردەکان بوو.

لە کۆتایی چاو پێکەوتنەکەدا. ئەفسەرەکانی دەستەی نێردراوی تورکیە. لە ئیحسان نوریان پرسی بە چ شێوەیەك دەتوانین راستەوخۆ یارمەتیت بدەین. ئیحسان نوری لەوەرامدا وتی: هاوسەرەکەم رەوانەی سووریە بکەن. ئەوانیش لەوەرامدا وتیان: ئەم پێشنیارەت بە هاوسەرەکەت رادەگەیەنین و ئەگەر پەسەندی کرد ئەینێرین بۆ سووریە. چەند ئەفسەرێك لەم ئەفسەرانە لە دۆستانی رۆژگاری شۆرشی ئەستەموولی ئیحسان نوری بوون.

هاوین تێپەری، خێڵەکان گەرانەوە شوێنی زستانەیان. شێخ عەبدولقادریش کە هەروەکو جاران، لەژێر سایەی دەولەتدا بوو لە دێهاتەکانی خۆیدا، کە لە باشووری خۆرئاوای ئاراراتدا بوو دانیشت مالّ و منداڵەکانیشی لە ئەزمیر ئازاد کران و هاتنەوە لای. ژمارەیەك لە خێڵی حسە سووری و هەم ئاوایی وێرانکراوی کانی کورك کە لەو دیو سنووری ئاراراتەوە واتە لەژێر دەستەڵاتی تورکیەدا بوون ئاوەدان کرانەوە و تیایا دانیشتن. کانی کورك لە رووی شوێنی جوگرافیاییەوە بۆ چاوپێکەوتن گەلێك لەباربوو. چەند رۆژێك لەدوای ئاوەدانکردنەوەی، چاو پێکەوتنێکی دۆستانە. لەنێوان سەرۆکەکانی ئارارات و فەرماندەو ئەفسەرانی سەربازگەی بایەزیدی تێدا ئەنجام درا. کوێخای دێکە حەمید ئیسماعیل پێشوازییەکی شایستەی لە میوانەکانی کرد. ئەم چاوپێکەوتنە لە کەشوهەوایەکی دۆستانەدا، ئەنجام درا. چەند وێنەیەکی ئەو چاوپێکەوتنە، سەرۆکەکانی هەردوولا بەیەکەوە گرتوویانە بەیادگاری ماونەتەوە.

هـــەندێك دوای ئـــەوە بـــە پێشـــنیاری حكوومـــەتی بایـــەزید، ســـەرۆكەكانی ئـــارارات لەگـــەڵ نـــاوبراودا واتـــە ئیحســـان نـــوری چاوپێكـەوتنێكی نوێیـان لەپشتی كـانی كوركـەوە ئـەنجام دا. لـــەم چاوپێكەوتنـــەدا حـــاكمی بایـــەزیدو چـــەند كەســـێك لـــە ســـەرۆكی تایەفـەكانی كـورد. كـە سـەر بـە دەوڵـەت بـوون لەگـەڵیا هــاتبوون. یـــەكێكیان تـــەیموور كەســـكۆیی بـــوو لـــەكاتی گفتوگۆكـــەدا كـــە سەرۆكەكانی كوردی ئارارات ئامـادەبوون، بـۆ دڵخۆشـكردنی حاكمـە توركەكـە، خـۆی بـە توركـی كـوڕی تـورك ناسـاند. ئـەم دەربڕینـەی تـەیموور بـەلای كوردەكانـەوە زۆر گرانبـوو، لـەوێدا بـرو حسـكی زۆر لەسـەرخۆو بـە سـووكایەتییەكەوە وتـی (خـوا لەگـەڵ برادەرەكانتـا پێكەوە حەشرتان بكات).

چاوپێكەوتنەكە لە كەشوهەوایەكی ئاوەهادا پێكهات و بەرێكەوت لە زستانی هەمان ساڵدا لە جەنگێكدا كە لـەنێوان كـوردو هێزەكـانی توركا روویدا، كەلەشی تەیموور لەگـەڵ كـەلاكی ئەفسـەرێكی توركـدا پێكەوە لە چاڵێكدا دۆزرانەوە. چەند رۆژێك لە دوای چاوپێكەوتنەكـە چـەند رووداوێـك روویانـدا كـە دەریـانخسـت ئـەم چـاو پێكەوتنـە بـۆ هەڵخەڵەتاندنی سەرۆكەكانی ئارارات بوو.

* * *

بەیانییـەكی پـایز بـوو هـەوا بـــە یـادی بــەرە بــەیانیانی بــەهار شەونمەكانی بە زەویدا دەپژاند، چیمەنـە ژاكاوەكـان شـەونمەكانیان وەكو دڵۆپـی مرواری و فرمێسك لە سەر رووـمـەتی زەرد هەڵگـەڕاویان بەرەو خوار خلۆر دەكردەوە. تیشكی خۆر پــەردەی تـاریكی شـەوی دڕی بـوو و لـە ژوور هەورەكانـەوە دەگەشـایەوە. تـازە تیشـكەكانی

بەرەو زەوی داشکاندبوو کە چەند تەقە تفەنگێك لە نزیکی هێڵی سنوور (کورد–تورك) بەرز بوونەوە بە دوای ئەویشدا دەستڕێژی شەستیرەکان بیسرا.

درێژەی نەکێشا کە بارەگای سەرکردایەتیی کورد– کورد ئاوا– کەنزیکترین خاڵی نیشتەجێی ئاراراتییەکان بوو لە سێ کیلۆمەتر زیاتر لە سنووری نێوان دوژمن و کوردەوە دوورترنەبوو بووە ئامانجی گولله تۆپەکان.

تورکەکان پەیمانەکەیان شکاند، بە زاراوەی خۆیان کوردەکانیان غافڵگیرکردووە. لەراستیشدا غافڵگیر کرابوون، چونکە لەو کاتەدا بەشێکی زۆری هێزەکانی ئارارات لە ناو خاکی تورکیە سەرقاڵی ئەنجامدانی ئەو کارانەبوون کە پێیان سپێردرابوو.

ژمارەیەك لە سوارە کوردەکان، کە پێیان سپێردرا بوو پارێزگاری بکەن لە خاڵە گرنگەکان و سترا تیژییەکان کە بۆ هێز رەوانەکردن لەبارن لە پشتی لووتکەی بڵندی ئاگرییەوەو هەروەها بگرن، چونکە تورکەکان هەموو جارێك لە کاتی لەشکرکێشییەکانیاندا، لە پێشەوە پەلاماری ئەو لووتکەیەیان دەدا تاکو لەوێوە ناوچەی نێوانی کوردەکان و خاکی بێلایەنی ئێران داگیربکەن و هێزی ئارارات گەمارۆبدەن. دێهاتەکانی ئارارات چۆڵکران، ژن و منداڵەکانیان چوون بۆ شوێنی دیاریکراو. فڕۆکەکانی تورك لە ئاسمانی ئاراراتدا دەستیان بە فڕینکرد، بۆمباو ئاگری شەستیرەکانیان بەسەر ژن و منداڵدا میکرۆبی مەرگیان دەباراند.

فەرماندەی کورد لەگەڵ برو حسکی و پازدە شۆڕشگێڕی پیادە لە شوێنی خۆیانامانەوەو تەماشای جموجووڵی دوژمنیان دەکرد.

جموجووڵەکانی هێزی دوژمن بە شێوەیەك بوو. کە نەدەزانرا ئامانجیان چییە و لەگەڵ کێدا دەجەنگن. تۆپەکانی دوژمن لەسەر بەرزاییەکانی دوور لە هێڵی سنوور سەنگەریان گرتبوو، هێزی سوارەشیان لە هەمان ناوچەدا لە هاتووچۆ دابوون. هێرشی سەربازی پیادەشیان نەدەبینرا، گوللەی شەستیرەکانیان ئاراستەی ئاراراتییەکان نەدەکرا. گەرمەی جەنگەکە لە ئاستی کانی کورکدا بوو.

ئەوە عەجایب بوو کە کانی کورك تەنها بیست و پێنج ماڵێك دەبوو سەر بە دەوڵەتیش بوون و بە پێی مۆڵەتی دەوڵەت لەو شوێنەدا نیشتەجێبووبوون، ئاراراتییەکانیش بەتەواوی ئاگاداربوون کە ئەم دێیە بچووکترین هەنگاویان لە دژی دەوڵەت نەناوەو شایانی ئەوەش نەبوون، کە لەلایەن هێزی دەوڵەتەوە پەلاماریان بدرێت. بە پێچەوانەی چاوەڕوانییەوە جارێك دووکەڵێکی خەست لە کانی کورك بەرزبووەوە. ژن و منداڵی دێکە رایان دەکردە دەرەوە و بەڕاکردن بەرەو ئارارات دەهاتن. گەیشتنە نێو سنووری ئارارات، هەروەها بەرەو ئەو ناوچەیەش کە شێخ عەبدولقادری لێبوو. گوێڕایەڵی حکوومەت رایان دەکرد و پەنایان پێدەبرد.

فڕۆکەکانی تورك درێژەیان بە ئەرکی خۆیان دا. گوللەی ئاراراتییەکان لاشەی فڕۆکەیەکی گەورەی دوژمنی پێکا و ناچاری کرد کە لە ناوچەی تورکەکاندا بنیشێتەوە. قارەمانێك لە سوارەکانی تورك بۆ پارێزگاریی فڕۆکەکە کەوتە رێ لەپشتی گردەکانەوە ونبوو. جەنگ تا ئەم کاتە تەم و مژاوی بوو، بەڵام زۆری پێنەچوو کە فەرماندەی کورد لە چۆنیەتیی رووداوەکە ئاگادار کرا. شەوی پێشوو

تورکەکان، کانی کورکیان گرتبوو، لە کەمیندا بوون کە نزیك ڕۆژبوونەوە هێرش بکەن. حەوت کەس لە شۆڕشگێڕەکانی کورد لەوانەش ئێلیخانی کوڕە بچووکەکەی برو حسکی و مەلا سەنعللاَ کە یەکێك بوو لەخۆبردووانی نەتەوەیی و ئایینیی کورد لە مزگەوتی ئاگریدا خوتبەی بە ناوی نەتەوەی کوردەوە دەخوێندەوە، تازە لەناوچەکانی ژێر دەستەڵاتی تورکەوە دەگەڕانەوەو لەدەمەو بەیانیدا چووبوونە ناو دێی کانی کورك. لە ناو دێکەدا لە نێوان ئەوان و چەند سەربازێکی تورکدا لێکدان ڕوودەدات. شۆڕشگێڕەکان چەند سەربازێکیان کوشتبوو چەکەکانیشیان گرتبوو و بەرەو ئارارات کەوتبوونە ڕێ دەنگی ئەم چەند تەقەیە، ترس و لەرزی لە ناو سەربازەکاندا بڵاوکردبووەوەو دەستیان بە تەقەکردن کردبوو.

لادێنشینە بێچارەکان سێ پیاوو سێ ژن و منداڵێکی چوار ساڵەیان لەکاتی هەڵاتندا لەپشتەوە بە دەستڕێژی شەستیرەکانی دوژمن کوژرابوون. دوو پیاوو کچێکی منداڵی سێ ساڵانەش بریندار بووبوون. براو ژنەکەی حەمید ئیسماعیل لە پاداشتی میواندارییەکەی چەند ڕۆژ لەوەو پێشی لە ریزی کوژراوەکاندا بوون.

ڕاست لەپێش ئەم ڕووداوە، فەرماندەی هێزی سوارەی تورك، کۆلۆنێل فەرهاد بەگ. کە نێردرابوو بۆ لای ئیحسان نوری، پێی وتبوو: بۆچی بهێڵین چەکدارەکانمان یەکتر بکوژن، بەڵکو بتوانین ئەم داواکارییانە بە شێوەیەکی دیکە جێبەجێبکەین؟ لەلای ئێمە لە نێوان یەکدووخێڵدا دوو کەس دەتوانن هەموو کێشەیەك جێبەجێبکەن. ئیحسان نوری لەوەرامدا وتی :ئەگەر ئەمە کێشەیەکی تایبەتی یەك کەس بووایە تەنها کەسێك لە ئێمە و دوو کەسیش لە

ئێوه بکوژرێت بەسبوو. ئەمە خودی سەرەك کۆماری تورکیەیە، کە دەبێت بێت و لەگەڵ مندا بجەنگێت چونکە ئێوە هاوشانی من نین، لەلایەکی دیکەشەوە ئەبێت ئەوەش بزانی کە ئەگەر من کوژرام لە ناو نەتەوەکەی مندا هەزاران کەسی وەك من بەڵکو لە من باشتر هەیە شوێنی من بەپەلە، پڕکاتەوە. بەشێوەیەکی دڵنیایی من و ئێوه رۆژو رۆژگارێك لەگەڵ یەکدا رووبەڕوو دەبینەوە؛ من و ئێوەو شانۆی جەنگ و نەبەرد.

هەر لەم شەوەدا ئیحسان نوری سوارە دیل کراوەکانی تورکی ئازاد کرد و داوای لێکردن کە ئەم وتانەی خوارەوە بۆ فەرهاد بەگ بگێڕنەوە: (هیوادار بووم ئێوه لە پێشەنگی هێزی سوارەی خۆتاندا ببینمەوە. تەنها ئەمە هۆی هاتنی من بوو زۆر سەرم سوڕما کە لێرەدا ئێوەم نەدی، ئەمەش جارێکی دیکە ترسنۆکیی ئێوەی بۆ من سەلماند، گوایە لەبەر ئەوەی بەردەستم نەکەویت، پێش گەیشتنم هەڵاتیت. ویستم بە چەککردنی سەربازەکانت شوێنی چۆڵ و هۆڵی ئێوه پڕبکەمەوە.

هەڵاتنی دانیشتووانی کانی کورك، ژمارەیەك سەربازی تورکیان بە شوێن خۆیانا ڕاکێشابوو. ئەوانیش لە پردێکی دارینی سەر سنووری ئارارات و تورکیە پەڕیبوونەوە و هاتبوونە ناو سنووری خاکی ئارارات.

ئاگادار بوون لەم رووداوە و بینینی دیمەنی دڵتەزێنی ژن و منداڵی بێچارەی هەڵاتووی کورد، لە دەستی زوڵمی سەربازانی تورك، ئیتر ماوەی پێشخواردنەوەی بۆ ژمارەیەکی کەمی ئاراراتییەکان کە لە بارەگای فەرماندەییدا بوون نەهێشتەوە.

جەنگاوەرەكانی كورد بڕیاریان دا كە نومایشێك، لە نموونەی قارەمانیەتییەكانی باب و باپیرانی خۆیان نیشان بدەن، ڕۆحی ئەو گەورە پیاوانە كە بۆ پاراستنی نیشتمان و ئازادیی خۆیان بە شمشێری ڕووتەوە، بەسواری ئەسپ بۆ ناو دەریای جەنگی دوژمن هێرشیان دەبرد، شاد بكەنەوە. ویستیان جارێكی دیكە پەردەیەك لە مێژووی جەنگی ئێران و توووران نیشانی جیهانییان بدەن، بیسەلمێنن نەتەوەی كورد بە ڕاستی، نەوەی ئەو پاڵەوانە ناودارانەی مەیدانی جەنگن. لە ڕۆحی چەك شۆڕی و لە خوێنی نەجیبی ئێرانیی ئەواندا هیچ گۆڕانێك ڕووی نەداوە، هیچ كەموكورتییەكیش نەهاتووەتە پێش. بەكورتی ویستیان لەم ڕۆژەدا نرخی ڕاستی و بێباكی و مەردایەتیی كوردو تورك بە یەكابكێشن و گەورەیی خۆیان دەرخەن، لەسەر زمانی دۆست و دوژمنی خۆیانەوە دانپیانان و سەلماندن ببیسن. ویستیان ڕۆحی خۆیان بڕژێننە بەر پێی بووكی ئازادی، بڕیاریان دا هەرچەندە ئەیانزانی و ئاگاداربوون كە چەكی دوژمن زۆرترو بەهێزترە، ژمارەی جەنگاوەرەكانیش یەك بەرانبەر بەسەدە، پەلاماری هێزی توركیان دا. دەبێت بێباكی و سام و هەیبەتی شۆڕشگێڕانی كورد جێگەی كەمیی ژمارەیان پڕبكاتەوە.

لەدوای ماچكردنی ئاخرین بەردەرەشەكانی ئارارات، یانی حەجەرولئەسوەدەكانی ئەم كەعبەی كوردە، پشت لە ئاگری و ڕووبەڕووی دوژمن دەستیان بە دژە هێرشی بەرانبەر كرد. مەیدانی نەبەردەكە تەختایی بوو و لە دەرەوەی چیای ئارارات بوو، لەم ڕووەوە ئیتر دوژمن نەیدەتوانی بلێت كوردەكان لە سایەی دۆستایەتیی چیای ئاراراتدا خۆیان لە چنگی ئێمە ڕزگاردەكەن. لە

رووی ژمارەی سەربازو جۆری چەکەکانیشـەوە هـێزی دوژمـن گـەلێك باشـتر و بـەهێزتربوون، لـە رووی جۆگرافیشـەوە سـەنگەری باشـیان هەبوو، چونکە لە پشتی گردۆڵکەکان و لەناو دێهاتەکاندا سەنگەریان لێدابوو. لەوکاتەشدا ئاراراتییەکان لە دەشتاییەکی تەختدا بەبێ هیچ پەناگایـەك مابوونـەوە، بـەڵام لـە بەرانبـەر ئـەم هـەموو بارودۆخـە لەبارەی تورکەکان و زۆرو زەبەندییان، شۆڕشگێڕانی کورد بڕیـارێکی پتەویان هـەبوو. ئـەتوت روحـی پاڵەوانـە دێرینـەکانی ئـێران لـە نێـو لەشیاندا چەکەرەی کردووە. لەم کێبەرکێ گیانبازییەدا هەموو کەس ئەیویست گۆی هونەرو پێشکەوتن لەوانی تر بباتـەوە. ئاراراتییـەکان ئامادە نەبوون خوێنی بێتاوانەکان بڕژێـت و تاوانبارەکـان بـە سـزای تاوانەکانیان نەگەن. سووربوون لەسەر ئەوە کـە گوڵاڵـە سـپییەکانی پـایزە، کـە لـە نێـو چیمەنـەکانی دەورو پشـتی رووبارەکـان خۆیـان دەنوان بە خوێنی خۆیـان سـوورکەن و بیرازێننـەوەو جـارێکی دیکـە ئاڵای نەتەوەیی کورد بەرجەستەبکەن.

لەبەرانبەر ئەم هەموو بڕیارەدا ئیـتر گوللـەی شەسـتێری دوژمنـی دروێنەکەرو سەربازی پیـادەو تـۆپ لەبـەر چاویانـا هیـچ گرنگییـەکی نەمابووەوەو نەیاندەتوانی رێگـە بـە شۆڕشـگێڕەکان بگـرن. خوێنـی جـەنگاوەرانی کـورد هـاتبووە کـوڵ هێرشـێکی ترسـێنەرانەیان بـردو سەربازی پیادەی دوژمن کەوتە پاشەکشـێ، عوسمـان کـەلیم لەگـەڵ چوار سواردا گەیشت و بەرەو ئاراستەیەکی دیکە رەوانە کرا.

سەربازە تورکەکان خاکی ئاراراتیان بەجێهێشـت و گەڕانـەوە بـۆ دێی کانی کورك. کوردەکان بە راکـردن بـە دوایانـەوە بـوون. چەکـە قورسـەکانی دوژمـن پـردە دارینەکـەیان گوللـە بـاران دەکـرد کـە

دەکەوتە سەر رووبارەکەی پێش گوند. جەنگاوەرە کوردەکان بەسەر زەویدا راکشابوون.

سوارێك لە ئاراراتەوە خۆی گەیاندە شۆڕشگێڕە هاوڕێیەکانی بەبێ ئەوەی گوێ بۆ ئامۆژگارییەکانی هاوڕێکانی راگرێت بەرەو پردەکە کە هێشتا لە ژێر لێزمەی گوللە و ئاگری دوژمندابوو، بەپەلە رۆیشت و لە پردەکە پەڕییەوە و خۆی گەیاندە کانی کورك. دەنگی دوو فیشەك بەرزبووەوە بە شوێن ئەویشدا جەنگاوەرانی پیادە لە پردەکە پەڕینەوە. کانی کورك چۆڵکرا، چەند ژنێکی نەخۆش و دوو گیان کە لە ماڵەکاندا خۆیان شاردبووەوە هاتنە دەرەوە. لاشەی ئافرەتێك کە نەیتوانیبوو خۆی لە دەستی سەربازە تورکەکان رزگار کات، لەناوەڕاستی دێکەدا کەوتبوو لەکاتێکدا شوێنەواری حەوت هەشت نێزە بە ورگ و سینگییەوە دیاربوو. ئەم ژنە ژنی ئامۆزایەکی حەمید ئیسماعیل بوو.

دوای ئەوە دێکە گیرایەوە. ژنە رزگاربووەکان بە چاوی گریاناوییەوە خۆیان گەیاندە لای سوارەکە. کەوتنە بەر دەست و پێی ئەسپەکەی و ئاوزەنگییەکەی و سمی ئەسپەکەیان لەناو دەرای ماچدا نوقوم کردو لاشەی ناسکی خۆیان بۆ دەکردە قەڵغانی گوللەی دوژمن. ئەم دیمەنە حەسرەت ئەنگێزە هەستی تۆڵەسەندنەوەی کوردەکانی زیاتر جووڵاند، ئیتر هیچ هێزێك توانای ئەوەی نەبوو، کە بتوانێت شۆڕشگێڕەکان راوەستێنێت.

نۆرەی هێرش و پەلاماری برو حسکی هاتە پێشەوە. بە پێداگرتنێکی زۆرەوە، ئەسپەکەی لە سوارەکە سەند و بە تەنها پەلاماری سەنگەرەکانی دوژمنی دا. رێگاکە دوور و زەوییەکەش

تەخت بوو. بەڵام دەشتەکە بەرداوی بوو. شەستیرەکانی دوژمن دەستڕێژەکانی خۆیان زیاتر کرد، بەڵام گوللەی شۆڕشگێڕکانیش وەکو باران بەسەر سەنگەرەکانی دوژمندا دادەباری و نەیانهێشت برو حسکی بپێکرێت. برو حسکی خۆی گەیاندە دامێنی گردەکە. لەوێدا لە دوژمنەوە دیارنەبوو، لە بەلاّی گوللەی دوژمن پارێزراو بوو. لە ئەسپەکە دابەزی و لەسەرخۆ بە گردەکەدا سەرکەوت. سەربازەکانی تورك لەم سەنگەرەدا تەنها چەند کەسێك بوون کە چاودێریی پاشەکشێی سەربازەکانی دوژمنیان دەکرد.

عوسمان کەلیم لە خێڵی زیلان لە تایەفەی دڵخێری کە لەناو تورکەکاندا بە ئەلتوندیش ناسراو بوون. لەگەڵ چل سواری خۆیدا. لەسەر پردێکی دارینی دیکەوە پەڕییەوەو بەرەو ئەو گردۆڵکانە کە لە پشتی سەنگەرەکانی دوژمنەوەبوون هێرشی برد، دوژمنی لە سەنگەرەکانا هەڵکەند.

جەنگاوەرە پیادەکانی کورد بەپەلە خۆیان گەیاندە ئەو شوێنەی کە برو حسکی هێرشی بۆ بردبوو. پاشماوەکەی دوژمن توانای بەرگرییان نەمابوو، چونکە ئەیانبینی کوردەکان گوێ بە گوللەکانیان نادەن و بەپەلە بەرەو پێشەوە هێرشدەبەن. دیمەنی ئەم جەنگە لەڕادەبەدەر شایانی تێڕامانبوو. زیاد لە دوو هەزار کەسی پیادەو سواری راهێنراو کە چەکدار بوون بە تۆپ و شەستیری گەورەو بچووکەوە. لەبەر دەم هێرشی دلێرانەی بیست پیادەو شەش سواری کورد، وەکو ئەوەی گورگێك کەوتبێتە ناو رانەمەڕێکەوە هەڵدەهاتن. فەرماندەی لەشکری تورك لە هەمووان زووتر خۆی لە جەنگەکە دەرباز کردبوو، ئۆتۆمبیلی فەرمانداری رەوانە کردبوو تاکو

تۆپـەکانی پێڕاکێشـن و رزگایـان کـەن. شەسـتیرە گـەورەکان لــەناو دۆڵـەکاندا تلـێر دەبوونـەوە. فڕۆکەکـــەو پارێزەرانیشـــی بـــەجێمان. ژمارەیەك سەرباز بە دیل گیران و کوردەکان تاکو دێـی قوتیـس، کـە لە ناو قـــەدی چیای بایـەزیدا بـوو چوونـە پێشـەوە. مـاوەی نێوانـی دوژمـن و هێرشـبەرانی کـــورد دوورتـــر کەوتـــەوە لەگـــەڵ ئەوەشـــدا کوردەکان، دوژمنیان بە گوللە باران بەدرەقە دەکرد.

دێهاتییەکی کورد کە ئیبراهیم ئازوی ناو بـوو فڕۆکـەوانی فڕۆکـە کەوتووەکـەی گـەیاندبووە شـاری بایـەزید. لـەم کاتـەدا گەیشـتەلای جەنگاوەرانی کورد و وتی: کاتێك کە من لـە رێگـای شـەیتانەوە (کـە رێگایەکی باریکە لە نێوان قوتیـس و بایـەزید) گەیشـتمە گەردەنـەی بایـەزید، لەشـکری تـورك لەبەردەمتانـــەوە هـــەڵدەهاتن. ژمارەیـــەك ئەفسـەری تـورك لـە گەردەنەکـەوە بـــەدووربین تەماشـــای مـــەیدانی جەنگەکـەیان دەکـــرد یـــەکێکیان دەســـتی لـــە ئـــەژنۆی، دەداو بـــە تووڕەییـەوە ئـەیوت: (خوایـە ئەمـە چ بەدبەختییەکـە. ئـەم هـــەموو پیادەو سوارە، بەم هەموو چەك و تەقەمەنییەو تۆپ و شەستیرەوە، لە بـەردەم دە کـوردی رووتەڵـەو برسـیدا هـەڵدێن)، بـەڵام نـەدەزانرا فـەرماندەی لەشـکری تـورك، لـە ڕاپۆرتـی خۆیـدا ژمـارەی کـوردە ئاراراتییەکانی بە چەند نووسیوە. ئـەم جەنگـە ئەفسانەیەکی لـەناو خەڵکدا دروستکردبوو کە ئەیانوت ئاراراتییەکان لە جـەنگدا سـوارانی سـەرتاپا سـپی دەردەکـەون کـە دەبنـە هـۆی شـکاندنی سـەربازانی تورك.

عەسربوو بـوو، ئاراراتییـەکان بـە دوای فڕۆکەکـەدا دەگـەڕان. دە دوازدە شۆڕشگێڕ کە ئەیوب ئاغای برای برو حسکی، چەند کەسێکی

مووسا بەرکی لەگەڵیابوو، زووتر خۆیان گەیاندە پاسەوانەکانی فڕۆکەکە، جەنگێکی سەرقاڵکردن رووی دا. بارودۆخی سەربازەکان گەلێك لەباربوو. لە نێوان تەپۆڵکە جیاجیاکانی تابیەی نزیکی دێی دودگان سەنگەریان گرتبوو. ئاراراتییەکان لێرەدا دەبوایە نزیکەی کیلۆمەترێك بە تەختاییەکداو لە ژێر بارانی گوللەی دوژمندا بڕۆنە پێشەوە. فەرزندەبەگ حسنی و سەید رەسووڵ بەرزنجی-دوو مەردی جەنگاوەری ڕۆستەم پەسەند- دەورو بەری لای پشت و چەپی سوارانی تورکیان ئاگر باران کرد. پیادە کانیش بەپەلە ماوە تەختاییەکەیان بڕی و سەنگەرەکانی پێشەوەی تورکەکانیان داگیر کرد. سەربازەکان لە پشتی سەنگەرەکانیانەوە خۆیان قایم کرد. ئەو سوارە کوردەی کە لە هێرشی پێشوودا بێباکانە خۆی گەیاندبووە کانی کورك، لێرەشدا دووبارە خۆی گەیاندە ناوەڕاستی سەنگەرەکانی هەر دوو لا. بەسوود وەرگرتن لە گۆشەیەك کە چەکی دوژمن نەیدەگرتەوەو لەوێدا راوەستا. فەرماندەی سەربازەکانی ئەو بەشە، چونکە بەرگری کردنی بەبێ سوود زانی، فەرمانی گەڕانەوەی بۆ دواوە دا. خۆی و سێ کەسی دیکە بە سواری هەڵاتن. ئەوانی دیکەشیان خۆیان بۆ نەگەیەنرایە لای ئەسپەکانیان، بە پێ پاشەکشێیان کرد. فەرزندەو سەید رەسووڵ، چونکە لەکاتی تەقەکاندا لە ئەسپەکانیانەوە دوور کەوتبوونەوە چوون بە شوێن ئەسپەکانیاندا و لەوێشەوە کەوتنە دووی ئەفسەرە هەڵاتووەکان، بەڵام کات درەنگ بوو و نێچیریان لە دەست دەرچوو بوو. ئیتر دەنگی تەقە نەدەهات. سوارە بێباکەکە کە لە دۆڵەکەدا چاوەڕوانی هەلێکی دەکرد، تاکو لە فرسەتێکدا پەلامارێك بدات. پەلاماری

سەنگەرەکان و شوێنی ئەسپەکانی دا. جگە لە چەند سەربازێکی کوژراوو بریندار و کۆمەڵێك چەك هیچی تر بەجێ نەمابوو. شۆڕشگێڕە پیادەکانی دیکە. هێشتا نەگەیشتبوونە ئەو شوێنە. سوارەکە ئیتر چاوەڕوانی پیادەکانی نەکرد. ئاوزەنگی لە ورگی ئەسپەکەی دا و خۆی گەیاندە نزیکی دوژمن. ئەو سەربازانە کە ژمارەیان نزیکەی شەست سەرباز دەبوون. بەپەلە بەرەو دواوە رایان دەکرد. چەند کەسێك لەوانەی کە دەگەڕانەوە سوارێکیان لە دوای خۆیانەوە دی، کە بەتاو هێرشی بۆ دەبردن. سوارەکە هەلی لەدەست نەدا بەبێ ئەوەی مۆڵەتی بیر کردنەوە بە سەربازەکان بدات فیشەکێکی تەقاندو بە زمانی تورکی تێی خوڕی و فەرمانێك لە شێوەی فەرمانی ئەفسەرانی تورکی پێدان و وتی: خۆتان بە دەستەوە بدەن، دەستان بڵندکەن.

سەربازەکان هەروەکو کەسێکی گوێڕایەڵ مل کەچی فەرمانەکەی بوون. سوارە کوردەکە چووە ناو سەربازەکان و تفەنگێك و پشتی فیشەکی لێسەندن چونکە لەو کاتەی کە دوایەمین گوللەی خۆی تەقاند لەپێش فەرمانی خۆبەدەستەوەدان و ئەو دەمانجە دە تیرییەش کە پێی بوو لەکارکەوتبوو. دڵی دیلەکانی دایەوەو پەیمانی پێدان کە شەو هەموویان ئەنێرێتەوە بۆ شوێنی خۆیان. شۆڕشگێڕە پیادەکانیش، خۆیان گەیاندبووە ئەسپەکانی دوژمن و هەموویان سوار بوون لە دواوە ئەوانیش گەیشتن و هەموو پێکەوە چوونە لای فڕۆکەکە. ئاراراتییەکان لە بەختی رەشیان فڕۆکەوانیان نەبوو. تاکو سوود لە فڕۆکەکە وەربگرن، بەڵام نەیانتوانی لەو شەستیرانە خۆشبن کە لە فڕۆکەکەدا بەسرابوون.

لەبەر ئەمە شەستیرەکانیان لێکردەوەو دەریانهێنان و ناو فڕۆکەکەیان پڕکرد لە پووشو پەلاش. فەرماندەی کوردەکان لەگەڵ ئەحمەد حاجی برو حەیدەری بە لای فڕۆکەکەوە مانەوە. شۆڕشگێڕەکانی دیکە بەرەو ئارارات کەوتنە ڕێ و دوور کەوتنەوە. ئەم دوو کەسە چەند خولەکێك. تەماشای پەیکەری گەورەو زەبەلاحی فڕۆکەکەیان کردو بۆ خوا حافیزی ئاگریان نا بە پووشو پەلاشەکانی ناو فڕۆکەکەوەو ئەسپەکانیان تاودا تاگەیشتنەوە بە هاوڕێکانیان.

پەریی شەو باڵە ڕەش و تاریکەکانی خۆی بەرووی ئەم کوشتارگایەدا راکێشان و لەبەر چاوا شارایەوە. بێدەنگییەکی سەر سووڕهێنەر جێگای ئەو هەیاهوو گرمەو ناڵەی تۆپ و شەستیرە جەهەنەمییەکانی گرتبووەوە. تەنها دەنگی پێی ئەسپەکان بوو کە بێدەنگییەکەی تێك دەشکاندەوە. ناڵەی بریندارەکانیش گوێی سەبەبکارانی ئەم جەنگەی کەڕکردبوو. دەستی تۆڵە پاداشتی هێرشبەرانی بۆسەر ژن و منداڵانی بێدەستەلاتیان دایەوە. بڵێسەی گڕی فڕۆکەکە بە ڕووناکییەکانی خۆی شۆڕشگێڕەکانی بەرێ دەکرد. ئەو بۆمبایەی کە بۆ کورد کوشتن بە ژێر فڕۆکەکەوە بەسترابوو، تەقییەوەو بە دەنگێکی زۆر گەورە سەرکەوتنی شۆڕشگێڕانی ئاراراتی ڕاگەیاند. بەم تەقینەوەیە ئاخرین پەردەی شانۆگەریی کانی کورك کۆتایی هات. دیلەکانیش بە پێی ئەو بەڵێنەی پێیان درابوو بەرەلاکران. ئەمجارە ئاراراتییەکان جل و بەرگی سەربازەکانیان داماڵی تەنها بە کراسێك و دەرپێوە ڕەوانەی شاری بایەزید کرانەوە، تاکو دانیشتووانی شار بە چاوی خۆیان ئەنجامی لەشکرکێشییەکەی

تورکان و جەنگە خوێناوییە کە ببینن. هاژەی ئاوی رووباری سەر سنوور وەکو ئەوە وابوو کە ئەم شیعرەی مارشی نەتەوەیی ئارارات بخوێنیتەوە:

(رۆژا ئازاد سەر تە هەلآت خاکی ئارارات ئازیز تر بوو)
چیای ئاگری شکۆمەندتر دەهاتە بەر چاوی کوڕانی ئاگری و
ئەم بەشەی مارشی ئاراراتیان لە بەر خۆوە دەخوێندەوە.
روونـــــاهی تا دەریا رشاند نـــــاو مللەتا ئازادی چانـد.
هــــەلبە ئاگری– هەلبە ئاگری
ژساوە تۆ ترک وێ گری تە دید چاوا رۆمی رەڤی
هــــەلبە ئاگــــــــری– هەلبە ئاگری

ماناکەی:
رووناکی خۆت گەیاندە دەریا لەناو میللەتدا تۆوی ئازادیت چاند
هەلبە ئـــاگری هەلبە ئاگــــــری
لەشکۆمەندی تۆ تورک دەگری تۆ دیت تورک چـــۆن رایانـــکرد
هــــــەلبە ئاگــــری هەلبە ئاگـــری

جەنگی کانی کورك و بە تایبەتی جەنگی فڕۆکە کە لە بنکە سەربازییەکانی سەر سنووری ئێرانییەکانەوە بە جوانی دیار بوو بە دووربین دەبینران. نوێنەری ئەرمەنییە کۆچەرییەکانیش لە کاتی جەنگەکەدا لە ئارارات بوون ئەم دلێرییەی کوردیان بە چاوی خۆیان بینی. لەبەر ئەمە دەتوانین بلێین ئەم نومایشە دلێرانەیەی کورد لە بەردەم دەستەی بە ویژدانی بێلایەندا ئەنجامی گرتووەو ئەم راڤەیەی کە خرایە پێشچاوی خوێندەواران هەرگیز شایانی گومان و

دوودڵی نییه. فەرماندەی کورد بەیاننامەیەکی دەرکرد و داوای لە رای گشتی کرد بۆ داوەریکردن. لەم بەیاننامەیەدا ئەمە نووسرا بوو: کوردەکان سەربازە دیل کراوەکان کە بۆ کوشتنی کوردەکان هاتبوون لەدوای چەککردنیان لەو پەڕی ڕێزگرتندا ئازادیان کردن. تورکەکان بە پێچەوانەوە نەك تەنها پیاوەکان بەڵکو ژن و منداڵانی کوردەکانیان هەریەکێکیان بەر دەست کەوتایە، بە ناشیرینترین شێوە دەیانکوشتن. لە کاتێکدا خۆیان بە شارستانیترین دەوڵەتی کۆن و کوردەکانیان بە یاخی و وەحشی ناودەبرد. ئایا لەم دووانە کامیان بەتایبەتمەندییە بەرزە مرۆیی و شارستانییەکانەوە وەسف دەکرێت؟

چالاکیی شۆڕشگێڕانی ئاراراتییەکان لە دەورو بەری بایەزید سەرلەنوێ دەستی پێکردەوە. زستانی سارد هاتە پێشەوە. زەوی ئارای سپیی بەرووی خۆیدا پۆشی، چالا کییەکانی کەمتر کردەوە. ئاراراتییەکان دوازدە دەستگای تەلەفۆنیان بە دەست هێنابوو، بەڵام لە بەر ئەوەی وایەریان نەبوو بەبێ سوود کەوتبوو، شەوێك ژمارەیەك سواری هەڵبژاردە نێردران بۆ ئیستگەی بایەزید کە هۆردووگای سەربازە تورکەکان بوو، تاکو هەندێك وایەر بێنن. ئەم چالاکییە سەرکەوتووانە ئەنجام درا. لە ڕۆژەکانی دواییدا پەیوەندیی تەلەفۆنی لە ناو ئاراراتییەکاندا سازدرا. ڕێکخراوی سەربازی ئارارات دامەزرابوو. شۆڕشگێڕەکان وێنەی دوو ئاگر کە لە برنجۆك دروست کرابوو، بە کڵاوەکانیانەوە بوو، ئەفسەرەکان لە باتی ئاگر، هێمای خۆیبوونیان بە کڵاوەکانیانا دووری بوو ئەو نیشانەیەی کە پلەی ئەفسەرەکانی دیاری دەکرد لە سەر شانیان بوو. هێمای خۆیبوون

بریتی بوو لە خەنجەرێکی ئەستوونی لــە ناوەراستدا، گوڵە گــەنمێك لەلایەکەوەو لەلایەکــەی تـر خامەیـەك بەشـێوەیەك کـە لـە خـوارەوە دەسـتی هەرسـێکیان پێکـەوە بەسـترابوون کـەر تێـك خـۆر لــە ژوور یانــەوە بــوو، واتـــە لــە لای ژووروی نووکــی خەنجەرەکــەوە بـــوو هەرسێکیانی نوقمی تیشکی خۆی کردبوو.

لـەم زسـتانەدا فـــەرماندارى تـــورك بـۆ لــەناوبردنی فـــەرماندەی شۆڕشگێڕەکانی کورد، پەنایان بۆ شێخ عــەبدولقادر بـرد. بـە بـڕوای خۆی هــەنگاوی نـهێنیی نـاوە. بـۆ ئـەنجامدانی ئـەم کارەیـان داودی کـوڕە گـــەورەی بــرو حســکی-یــان هــەڵبژاردبوو. تورکــەکان لــە پەرەسەندنی رادەی بیری ئازادی لە ناو کوردەکاندا بـێ ئاگـابوون. وایـان دەزانـی بـە دراوی زۆر و تــەماع دەتوانـن کەسـێکی ئــاراراتی بەرەو خیانــەت رابکێشـن. بـەڵکو لەوانەیـە نـەیانزانیبێت کـە هـەموو گفتوگۆکـان و ئـــەو هەنگاوانـــەی کەلـــەم رووەوە هــاوێژرابوون، بـــە ئاگاداری و فەرمانی فەرماندەی گشتیی شۆڕشگێڕانی کـورد ئـەنجام دەدرا. هەرچۆنێك بوو ئەم نەخشەیە ماوەیــەکی خایـاند، بـەڵام هیـچ ئەنجامێکی نەبوو.

بەهار هات. چیای ئـارارات بـە سـەوزی و گەشـاوەیی و بـە گوڵـی رەنگاوڕەنگ ئارایشی خۆی دەکرد. ئەمە چوارەم بە هار بوو کە ئەم چیا مێژووییە لە ژێر دەسـتەڵاتی دەوڵـەتی تەرکیـەدا دەرچـوو بـوو. کوڕانی دلێرو ئەمەکداری ئـاگری بـە لـەخۆبوردن و قوربـانیدان ئـەو شوێنەیان کردبووە مەڵبەندی نەتەوایەتی و ناوەندی ئـازادیی کـورد.

ئاڵای پیرۆزو سێ ڕەنگیی[*] کوردستانیان هەڵکردبوو، و دڵسۆزانەش پارێزگارییان لێدەکرد. ئەم چیایە جەنگاوەرانی خۆی وەك بەردی ئاگرینی گڕکەندەکانی سەرەتای دروستبوونی خۆی بە ناوچە جۆربەجۆرەکانی کوردستاندا بڵاودەکردەوە، پرشنگی بیری ئازادی مۆخی ناو ئێسقانەکانی فەرمانڕەوایەتیی بێگانەی دەسووتاند. هەموو گۆشەو کەنارێکی کوردستان وەکو پشکۆیەکی ئاگری لێهاتبوو. پرشنگی دەهاویشت و دەیسووتاندو ون دەبوو. ئاگرێك کە دەستە ئاگر کوژێنەوە و پرچەکەکانی تورکیە چیا بە چیا بە شوێن خۆیدا رادەکێشا. لە ئەنجامیشدا گیرۆدەی دەکردن و ئەوەی سووتاندن.

فەرماندەی کورد چونکە لە هیچ روویەکەوە هیوای یارمەتیدان و پشتیوانیی بۆ بەدەستهێنانی چەك و پێداویستییەکانی دیکەی شۆڕش نەبوو بەباشی نەدەزانی ناوچەکانی دیکەش رزگار بکات و بەرەکانی جەنگ زیاتر فراوان بکات. دەیزانی کە لە بەرانبەر تۆپ و فڕۆکە و تانگ و هێزە رێکخراوەکانی تورك تەنها بە تفەنگ، ئەویش ئەو تفەنگانە کە دەبوایە فیشەکەکانی لە سوپای دوژمنەوە دەست کەوێت و دابین بکرێت، فراوانکردنەوەی بەرەکانی جەنگ باش نییە، چونکە ئەیزانی ئەنجامەکەی لەناوچوونی ژن و منداڵانی کوردو وێرانبوونی وڵاتەکەیە و گەلیش بەرباد ئەبێت. لەبەر ئەمە وای بە باش زانیبوو کە ئارارات لە دەستی خۆیا رابگرێت و بەهۆی دەستەی گیانبازانی کوردەوە لە ژێر سایەی کوڕانی شۆڕشگێڕو نیشتمان

---

[*] ئاڵای کوردستان چوار رەنگە: سوور، سپی، سەوز و زەرد—دەزگای موکریانی.

پەروەری کوردا هێزەکانی دەوڵەتی تورك لە ناوچەکانی کوردستاندا داڕزێنێت بەم هۆیەوە ناڵەی هەژاری و ورە بەرنەدانی نەتەوەی کورد سەبارەت بەدەستهێنانی ئازادیی نەتەوەیی و مرۆڤایەتیی خۆی بە گوێچکەی جیهانیاندا بدات بڕشتی رامیاری و ئابووریی تورك بهێنێتە لەرزین. ئەمەش لە لایەنی دەستەی ناوەندی خۆیبوونەوە بە کارێکی پەسەند دەزانرا. دەوڵەتی تورکیەش لێرەدا هەمان رەفتاری رابوردووی خۆی پەیڕەو دەکرد. کە لە جەنگەکانی باڵکاندا لە ساڵی (١٩١٢) دا کە لە ئەنجامی گوێنەدان بە داخوازییە نەتەوەییەکانی ئەلبان بوو بەهۆی لە دەست چوونی ڕۆم ئێلی. لە توندوتیژیش لەگەڵ عەرەبەکاندا و کرداری بێبەزەییانەی جەمال پاشای وەزیری دەریاوانیی ئەوکاتی عوسمانی لە دیمەشق و بەداراکرنی سەرۆکە عەرەبەکان و راپەڕینی شەریف حسێن باپیرە گەورەی پاشای عێراق لەمەکەداو لە دەستدانی عەرەبستان هێشتا هۆشیاری نەکردبووەوە. لە تاو بیرو خەیاڵاتی پان تۆرانیزمی خۆی ئامادە نەبوو، بوونی کورد وەك بەربەستێکی ئاری نەژاد بوو، لە سەر رێگەی ئامانجە نەتەوەییەکانی خۆیا بسەلمێنێت.

لەبەر ئەمە، فەرماندەی کورد بۆ گەیشتن بەدوا ئامانجی خۆی، فراوانکردنی رێکخستنەکانی خۆیبوون لە کوردستاندا و بەدیهێنانی سەرەتاکانی راپەڕینێکی گشتی بە پێویست دەزانی، بۆ ئەمەش دەبوایە بەهۆی دەستە لەخۆبردووەکانەوە بە ڕێکوپێکی لە تەواوی ناوچە جۆربە جۆرەکانی خاکی تورکیەدا ترس و لەرز بڵاوبکاتەوە. ئەو دەستانەی کە بۆ ناو خاکی تورکیە رەوانە دەکران ژمارەیان کەم بوو، بەدەگمەن هەندێ جار ژمارەیان دەگەیشتە سەد جەنگاوەر. لە

شوێنەکانی گەلێك لە ئاراراتەوە دوور، ئەم ئەرکانە بە دەستە ناوچەییەکان دەسپێردرا و بەم شێوەیە دەستەڵاتداری تورك نەك تەنها لە شوێنە نزیکەکانی ئاراراتدا بەڵکو لە تەواوی کوردستانی تورکیەدا، لە ئاگری گڵپەسەندووی کوردا دەسووتان، بەڵام ناوەندی ئەم گڕکەندانە ئارارات بوو.

ئاراراتییەکان ژمارەیەکی کەم بوون، چونکە خاکی ئارارات لە رووی خواربارەوە، توانای پێکەوەنانی هێزێکی زۆری نەبوو، هەربەم ژمارە کەمەوە لە بەردەم لەشکری گەورەی کۆماری تورکیەدا سینگیان کردبووە قەڵغانی بەلای تەواوی کوردستان، ئەرکی دژوارو قورسی پارێزگاری کردنی ئازادیی کوردان لە ئەستۆدا بوو و لە گەلێك رووەوە لەگەڵ زۆر لە بێبەشبوونەکان دەستەو یەخە بون. هەمیشە گیانیان لە زەحمەت و مەترسیی گەورەدا بوو بەڵام رۆحیان لە ژێر ئالای نەتەوایەتیی خۆیاندا پڕ شەوق و شادی بوو. ژیان لە ئاراراتدا گەلێك سروشتی بوو، سەیران و سەرگەرمی ئاراراتییەکان غاردانی ئەسپ و تفەنگ تەقاندن بوو. بەڵام نەك تەنها لە سەیراندا، بەڵکو لە جەنگیشدا کەمتر شەستیریان بەکاردەهێنا. چونکە لە رووی فیشەکەوە لە تەنگانەدا بوون. شتێك کەلە ئاراراتدا جێگای نەبوو بووەوە ترس و یەئس و نائومێدی بوو.

لە دوای رووداوی کانی کورك هێزی دڵ و دڵنیایی ئاراراتییەکان زیاتر بوو، لەوە دڵنیابوون کە لەشکری تورك بە سوپایەکی گەورەشەوە زاتی هێرشی هەمە لایەنەیان بۆ سەر ئارارات نییە.

ئەفسەرێکی تورك بە ناوی زوهدی گویڤەن لە دوای گەڕانەوەی بۆ ناو فەوجەکەی خۆی لەبارەی جەنگی کوردەکانەوە ئاوای نووسیوە:

(له کـاتی جـەنگی ئاڵتووندا‌شـدا لـە دژی عوسمـان کـەلیم کـە لـە نزیکی خێڵی شمکـان بـوو. لـە ناوچـەی توزلیجـە لـە نێـوان ئیغدیـرو فاغزمـاندا) رووی دا. سـوپا لـە دوای کۆتـایی هـاتنی جەنگەکـە پاشەکشێی کرد. لەو کاتەدا کە گوردانی پیادە گەیشت لاشەی چـوار ئەفسەری تورکیان دۆزییەوەو لە هەمان شوێندا نایاننـە چـاڵ. رۆژی دوایـی کەوتینـە دووی ئـەو کوردانـە کـە بـۆ شـەمکان هـەڵاتبوون، رەوانەی چیاو دەشتەکانی ئەو ناوچەیە کراین. توانیمان شەش کەس لەوانـە کـە لـە نـاو چادرەکـاندا لـەو دەشـتەدا خۆیـان شـاردبووەوە دەستگیر بکەین و بـیانهێنین بۆ ناو سەربازگەکەمان).

ئەم کوردە دیلانە کە جگە لە چـەند شـوانێك هیچـی تـر نـەبوون. چەکداریش نەبوون و بە شێوەیەکی کوتوپڕی و بێئاگـایی دەسـتگیر کرابوون و بەبێ هیچ بەڵگەیەك خرابوونە ژێر ئازارو ئەشکەنجەوە.

دەوڵەتی تورکیە بریاری دا پەلاماری تایەفەی شمکان بدات کە لە ژێر سەرکردایەتیی تـەیموور ئاغادابوو. ژەنەڕاڵ سـوبحی فـەرماندەی ناوچەکـە فـەرمانی هێرشـی داو تورکـەکان لـە دێهاتـەکانی کۆپلاجـا (Koplaja)دا، دامەزران، زوهدی گیوان رووداوەکە ئاوا دەگێڕێتەوە:

(لەگـەڵ دەنگـی یەکـەم دەسـتڕێژی تفـەنگ، بـە پەلـە لـە چادرەکانمان هاتینە دەرەوە. خوومان بەوەوە گرتبوو کە بە بـەرگی سـەربازییەوە بخـەوین و چەکەکانیشـمان ئامـادە بێـت و لەبـەر دەستمانا بێت. دەنگی پاسەوانەکانمان بیست کە هاواریان دەکرد: ( ئالێرەداو ئالێرەوە هەڵات) کاتێك هـەموو دەرپەڕینـە دەرەوە. ئـامۆ زیندانی کرابوو. لە دەوەنێکدا دۆزرابووەوە. بەبێ ئـەوەی کـە ترسـا بێـت وەکـو شـێرێك دەینـەڕاند. دوو گوللـە پێکـابووی، یـەکێکیان

بەپشتی و ئەوی تریان بەردەستی راستی کەوتبوو یانی ئەو دەستەی کە تفەنگەکەی پێهەڵدەگرت. هەرچەندە برینداربوو ئامادە نەبوو چەکەکەی بە سەربازە تورکەکان بدات. هێنایان بۆ ناو چادرەکەو لێم پرسی بۆچی خۆت وەکو مەڕ لێکردبوو هاتیتە ناو دێکەوە؟ ئامۆ بەبێ هیچ ترسێك ودڵەڕاوکێیەك وتی: (بۆ تۆڵە سەندنەوەی خوێنی فەتۆی برام بڕیارم دا بچمە ناو چادری ئەفسەرەکانەوەو بیاندەمە بەر گوللە، بەڵام بەداخەوە پێش ئەوەی بتوانم کارە کەم ئەنجام بدەم پاسەوانەکان منیان دی).

ئامۆ لە تیرەی کەرم قاسم و خێڵی شمکان بوو. ئەو تووشی خوێن بەربوونێکی توند ببوو، لەکۆتایشدا هەر لەبەر ئەوە مرد. ئەم رووداوە ئەوە نیشان دەدات کە چۆن لە خۆرهەڵاتدا کوردەکان لە هەر بارودۆخێکدا، تەنانەت بە نرخی گیانیان، تۆڵەدەسێننەوە).

لە راستیدا ئامۆ بە برینەکانی نەمرد، بەڵکو کوشتیان. ئەم کارەش نیشاندەری رەفتاری سەربازە تورکەکانە لەگەڵ بریندارەکان دەکرێ بیربکەینەوە لە چارەنووسی ئەو کوردانەی دەیانویست خۆیان بەدەستەوە بدەن. ئەمەش نموونەیەکی دیکە؛ رۆژێکیان سوپای تورك چەند کەسێکیان لە خێڵی شمکان گرتبوو هێنانیان بۆ قەراکۆسە لە دەوروبەری بالیك گوڵ. رایانگەیاند کە ئەمانە لە هێرشێکی کوردەکاندا کوژراون. زوهدی گویڤەن چۆنیەتی رووداوەکە ئاوا دەگێڕێتەو: (لە کاتی هێرشدا پازدە کەس کە دەستیان لە پشتەوە بە سترابوو لە نێوان هەردوو بەرەی جەنگدا دانران و هەموویان کوژران).

لەراستیدا لەگەڵ ئەوەشدا کە بێتـاوان بـوون هـەموویان قـەتڵ و عام کـران بـە کۆمـەڵ کـوژران. ئەمـەش بەڵگەیەکـە لەسـەر گۆڕینـی راستییەکان لەلایەن تورکەکانەوە بۆ سوودی خۆیان و بڵاوکردنەوەی زانیارییە نادروستەکان لەبارەی ئەو کۆ کوژییانـەوە کـە ئـەنجامیان دەدان).

شێخ عـەبدولقادر خێڵەکـەی خـۆی لەگـەڵ خۆیا بـردو چـوو بـۆ چیای ئالاداغ. ئاراراتییـەکان حـەزیان نـەدەکرد کەشـێخ لەگـەڵ ئـەو پەیوەندییە چاکەدا کە لەگەڵ تورکدا هەیەتی لە گۆشەیەکی ئاراراتدا دابنیشێت.

دوو خێڵـی حسـە سـووری و قوتـان کـە ملکـەچی دەوڵـەتی تورکیەبوون لە نزیکی قزل دزە (ناوەندی گومرکی ئێران و تورکیە)دا بوون رێگەیان بە شێخ عەبدولقادر گـرت. لـەوەو پێـش سـەرۆکەکانی ئـەم دوو خێڵـە لەگـەڵ حکوومـەتی بایـەزید گفتوگۆیـان کردبـوو و حکوومـەت ئـەم هـەنگاوەیانی پەسـەندکردبوو چونکـە حکوومـەت دەیویست لە نێـوان خێڵـە کوردەکـاندا دوژمنایـەتی دروسـت بکـات، تاکو ببێتە هۆی لێکدانی یـەکتری و پێیـان وابـوو کـە ئـەم لێکدانانـە دەبێتـە هـۆی هەڵگیرسـانی جـەنگ و دوو بـەرەکی و بڵاوبوونـەوەی دوژمنایەتی لە نێوان ئـەندامانی ئـەو خێڵانـەدا کـە لـە نێـو سنووری ئارارات و لە پەنای شۆڕشگێڕەکاندابوون. کەواتە لەسەر ئەم خەیاڵـە و بەئومێدی ئەوەی کە ئاگری ناکۆکی و خوێن ڕشتن لە ئاراراتدا و لە ناو ئەو خەڵکەدا کە لە ژێر ئالای ئازادیی خاکی کوردسـتاندا دەژیـان و پشتیان بە ئازادیی کوردستان بەستووە هەڵگرسـێنێت موافەقـەتی کردبوو لـەوە بێئاگـا بـوو کـە لـە نـاو ئـەو کەسانەدا کـە لـە رێگـەی

گەڕاندنەوەی ئازادی و دابینکردنی یەکێتیی گەل گیانی خۆیان بەبێ چەندو چوون پێشکەش دەکەن. هیچ هێزێك ناتوانێت ناکۆکییان بخاتە ناو. بەتایبەتی رووداوێك وەك رووداوی شێخ عەبدولقادر.

لە دوای جەنگێکی کورت خێڵی ساکان رێگایان کردەوەو گەیشتنە ئالاداغ. پارێزگاری بایەزید کە لە ترسی ئاراراتییە شۆڕشگێڕەکان بنکەی خۆی بۆ قەرەکۆسە گوێزابووەوە شێخ عەبدولقادری بانگ کرد. ناوبراو چونکە لە حکوومەت خانە گومان بوو لەباتی خۆی برازاکەی کە ناوی شێخ حەسەن بوو هەم زاواشی بوو رەوانە کرد. سەرۆکەکانی حسەسووری و قوتان ئەم نەهاتنەی شێخیان لە لای پارێزگاری بایەزید بە یاخیبوون دایە قەڵەم. پارێزگارییان سەبارەت بە شێخ قادر زیاتر دوودڵ کرد و خستیانە گومانەوە، وایان دەردەبڕی کە شێخ لە دڵەوە لەگەڵ ئاراراتییەکاندا هاوڕێیە.

بەم پێیە نەخشەی داڕێژراوی فەرماندەی کورد جێگەی خۆی گرت. یانی شێخ کە ئەو کاتە لە گۆشەیەکی ئاراراتدا دانیشتبوو ئیتر حکوومەت گوێی پێنەئەدا.

ئارارتییەکان چووبوونە کوێستانی لووتکەی چیاکە. فەرماندارى تورك یەك گورهانی پیادەی لە برن سوور لە بەرانبەر پردە بەردینەکەی شێخلو کە بە سەر ئاوی سنووری نێوان ئارارات ودەوڵەتی تورکیە بەسترابوو، لەگەڵ گورهانێکی دیکەدا لە برن ڕەش بەرانبەر دێی کورد ئاوا جێگیر کرد کە سەنگەرەکانیان قایم کردبوو. چەند پۆستێکی دیکەشی کە تا سنووری ئێران درێژ بووبوونەوە بەهێزتر کرد. تۆپێکیشی لە برن سوور لە دەوروبەری دێی چفتلیك (

نێوان کوردئاوا و شـێخلو) بـه باشـی دەخسـتە ژێـر ئاگری خۆیـەوە دامەزراندبوو، ئەو ڕێگایەی دەبڕی.

لە ساڵی (١٩٢٢) لەو سـەردەمەدا کـە ئیحسـان نـوری پاراسـتنی ئاسایشی سنوورەکانی نێوان ئێران و تورکیەی لە ئەستۆدابوو، هـەر ئەم تۆپە بۆ بەرەنگاربوونەوەی پەلاماری لە ناکاوی لابەلایی لـە ژێـر فەرمانی ئەودابوو. بەهۆی دژواریـی بـارکردن و گوێزاندنەوەیـەوە لـە هەمان کاتەوە لەو شوێنەدا مابووەوە).

فەرماندەی تورك بەم کارەی و بە خەیاڵی خۆی ئاراراتی گەمارۆ دا بوو. لە کاتێکدا نەیدەتوانی بە تەواوی ئەم سـەرەتایانە ڕێگربێـت لە هاتوچۆی دەستە شۆڕشگێڕەکان. ئا لەم کاتـەدا کـە فـەرماندەی تورك بە هەموو شێوەیەك پۆستەکانی خـۆی قـایم و بـەهێز دەکـردو هـێزە شۆڕشـگێڕەکانیش بـە شـێوەیەکی دیکـە تـا دەهـات زۆرتـر دەبوون: عومەرئ بەسئ کە لە سەرۆکەکانی گلتوری بوو، لە دامێنـی باکووری ئاراراتدا و لە ناوچەی ئیغدیر نیشـتەجێبوو، عـەلویی گـوری لە خێڵی قزڵباش ئۆغلۆ، عەبدوللا خەڵەف گەورەی خێڵی قزڵباش کە لە ئازاترین لاوانی کورد بوو. چەند ساڵێك لەوەو پێش لە حکوومەتی ئێران زیز بوو بوو. لەگەڵ ژمارەیەك لە ئەندامانی خێڵەکەی لە خاکی تورکیەدا نیشتەجئ بووبوو. عومەر مەزراق لە بنەماڵەی سەرۆکەکانی زیلان پەیوەندییان بە ئاراراتییەکانەوە کردبوو. بەم شـێوەیە بەشـی باکووری ئاراراتیش کەوتە ژێر دەستەڵاتی هێزی گەلەوەو ڕۆژی کورد هەموو لایەکی ئەم چیا پـیرۆزەی بـە تیشـکی پـڕ لـە خۆشەویسـتیی خـۆی ڕوون دەکـردەوە. هەرچـەندە لـەم بەشـەی بـاکووردا چـەند خێڵێکـی تێدابـوون کـە لـە ژێـر فـەرمانی دەوڵـەتدا بـوون. لەگـەڵ

ئەوەشــــدا لـــە هیـــچ چەشـــــنە یارمەتییــــەکی شۆڕشـــگێڕەکان کەمتەرخـەمییان نـەدەکرد و هیـچ کارمـــەندێکی دەوڵــەتی تــورك چ چەکدارو چ بیٚ چەك زاتی نزیك بوونەوەیان لەم ناوچەیە نەبوو.

بە هاتنی ساڵی (١٩٢٩) دانیشتووانی ئاگری کە لە چیاکاندابوون. کوردێك بۆ چاوپێکـەوتنی ئارداشـس مرادیـان، کـە نوێنـەری حـیزبی داشناکی ئەرمەنی بوو و هاوڕێی ئیحسان نوری بوو، هات بۆ ئارارات. ئـەم کابرایـە بەسـتەیەکی بـۆ هێنـابوو، سـەری گفتوگـۆی لەگـەڵدا کـردەوە و وتـی: (کـوڕی مـامت بـۆ دیدارتـان لـە تفلیسـەوە هـاتووە بۆئێریڤان و ئەم دیارییەو ئەم نامەیەی بۆ رەوانە کردوویت).

لە نامەکەدا نووسرابوو: (ئاگادارکراوم کە لە ئـاگریدای داوامکـرد کە مۆڵەتم بدەنیٚ تابێم و بتبینم. ئێستا لە ئەرمەنستانم دەتوانین لــە بەیانییەکی زوودا. . . . ( ئەم خاڵانە لە نامەکەدا هــەبوو لـە ئـارالیق لە نزیکی ئاراس یەکتری ببینین).

ئێسـتا تورکـەکان نــاوی ئارالیقیــان گۆڕیــوە بــەدیل. ئــارالیق ناوچەیەك بوو لە ناوچەی چالاکییەکانی کـورد. چـەند جـارێك لـەوێدا پەلاماری تورکەکانیان دابوو، لە کەناری رووبـاری ئاراسـدا لـە نێـوان سنووری رووس و تورکدا بوو.

ئارداشس چەند جار وتی دەمەوێت بیبینم، چونکە چەندین ساڵە نەم دیوە. فەرماندەی کورد کە نەیدەویست مۆڵەتی بدات و بە تەنیا بڕوات. فەرمانی بە پازدە سوار دا کە لەگەڵیا بڕۆن. سوارەکانیش لە ژێـر سـەرکردایەتیی عومــەری بەسـیٚ -دا بــوون. ئیحسـان نــوری ئامۆژگاریی ئارداشس و عومەری کرد کە بــۆ نـاو بەشـی رووسـیە لــە رووبارەکـــە نەپەڕنـــەوە. ناوچـــەی ئـــارالیق یـــانی شـــوێنی

چاوپێکەوتنەکەیان لە دامێنی ئاگریدابوو. ناوچەیەکی وشك و گەرمی بێ کشتوکاڵ بوو بێ دارو درەخت و ئاویش بوو. بێجگە لە دەشتی ئاراس کە لەوبەری رووبارەکەوە بوو یانی لە بەشی رووسیەدا بوو، پۆستێکی پاسەوانی سنووری رووسی تێدابوو. ئەو بەشە بەدارودرەخت و سەوزایی داپۆشرابوو.

ئەفسەری فەرماندەی پاسەوانەکانی سنووری رووسیە بە زمانی رووسی بە ئارداشس کە لەوبەری رووبارەکەوە لەگەڵ عومەری بەسێ و هاورێکانیاندا راوەستابوون، بانگی کردن وتی: کورِی مامت لە ئێریڤانە هەر ئێستا تەلەفۆنی بۆدەکەم کە بێت. لە راستیدا ئەم ئەفسەرە ئەرمەنی بوو، ئارداشس دەیناسی. هەر لەبەر ئەوە بە زمانی ئەرمەنی بانگی لە ئەفسەرەکە کرد، ئەفسەرە سنوورەوانەکە وەڵامی دایەوەو وتی زمانی ئەرمەنی نازانم بە رووسی بدوێ. ئارداشس سووربوو لەسەرئەوە کە زمانی ئەرمەنی دەزانێت ئەفسەرەکەش نەدەچووە ژێری. لە دوای چەند خولەکێك ئەفسەرە رووسیەکە پێشنیاری کرد کە لە رووبارەکە بپەرِنەوە بێن بۆ لای، چونکە ئەوبەرەوە بۆ چاوەڕوانی کردنی هاتنی ئامۆزاکەی لە بارترو فێنکتر بوو. لە هەمان کاتیشدا ئەم بەری رووبارەکە زۆر گەرم بوو. ئارداشس رووی کردە عومەری بەسێ وتی : (راست دەکا بابرۆین و کەمێك ئیسراحەت بکەین). عومەری بەسێ لەوەرامدا وتی تۆ نەتبیست کە ئیحسان نوری بە راشکاوی پێی وتین کە لە رووبارەکە نەپەرینەوە و نەچینە ئەوبەر، بەڵام ئارداشس لە وەڵامدا وتی: ئەو نەیدەزانی کە ئێمە لە ژێر ئەم هەتاوە گەرمەدا ئەبێت ئەوەندە چاوەڕوانی بکەین، ئەگەر نایەیت خۆم بە تەنها دەڕۆم. عومەری

بەسیٚ کەزانی سەر پێچی هیچ سوودێکی نییە و نەشی دەویست بە تەنها رەوانەی بکات لەگەڵ چوار سواردا لەگەڵیا رۆیشت. بۆ ئەوەی کە رووسەکان نەتوانن بڵێن کوردەکان رێز لە ئارداشس ناگرن. دوای ئەوەی لە رووبارەکە پەڕینەوە، ئەفسەرە سنوورەوانەکە وتی نووسینگەی من لەم نزیکانەیە. با بڕۆین بۆ ئەویٚ لەویٚ چاوەڕوانی ئامۆزاکەت دەکەین. چونکە لەویٚ ئیسراحەتترە. فەرمانی بە سوارێك دا کە لەگەڵیانا بڕوات ئەوان کەوتنەڕیٚ کاتێك گەیشتنە فەرمانگەکەو چوونە ژوورەوە عومەر بایز لە نیازی رووسەکان کەوتە گومانەوە. بە ئارداشسی راگەیاند، ئەویش بۆچوونەکەی پەسەند کرد.

رووسەکان بەجارێك لەگەڵیاندا بە ساردی رەفتاریان کرد، چەکیان کردن. هیچ هەواڵێکی ئامۆزاکەشی نەبوو. عومەری بەسیٚ کە مرۆڤێکی ئەزموونداربوو و گەلێك دژواریی رۆژگاری دیتبوو. بە ئارداشسی وت :من ناتوانم، بەڵام تۆ ئەگەر دەتوانی هە لیٚ. عومەری بەسیٚ چوو بۆلای لێپرسراوی پۆستەکەی سەر سنوورو پێی وت سوارەکانم لەو بەری رووبارەکەن، لە ژێر ئەو هەتاوە گەرمەدان. دەمەوێت بچم بیانهێنم. ئەفسەرە رووسییەکە بە بیستنی ئەم هەواڵە دیاربوو بە سەربازێکی راگەیاند، کە ئەسپێکی بۆ ئامادە کات، بەڵام عومەر وتی دەبێت سواری ئەسپەکەی خۆم بم، چونکە تفەنگەکەم بە ئەسپەکەوەیە ئەگەر بە ئەسپێکی دیکەو بیٚ تفەنگ بڕۆم سوارەکانم گومانم لێدەکەن. ئەفسەرەکە پێشنیارەکەی پەسەند کرد لە دوای پێدانەوەی ئەسپ و تفەنگەکەی. ئەویش بەرەو رووبارەکەو ئەفسەرەکەی سەر سنوور رۆیشت. ئەفسەرەکە مۆڵەتی پەڕینەوەی بە عومەر نەدا و پێی وت هەر لێرەوە دەتوانی بانگیان کەیت. کە

بێن بۆ ئێره عومەر وتی ئەوانە کوردن وەکو ئێوە دیسپلین ناپارێزن، تا تەنها بە بیستنی فەرمان کاربکەن ئەگەر نەتوانم ئەوانە رازی بکەم هەرگیز نایەن. ئەگەر دەتەوێت بێن دەبێت بۆ خۆم بڕۆم و بیانـهێنم. لە ئەنجامدا ئەفسەره کە قوبوولّی کرد عومەر بەسێ چووە ئەو بەری رووبارەکـەوە گەیشـتەوە لای سـوارەکانی. بەسـەرهاتەکەی بـۆ گێڕانەوە و بە تاو بەرەو ئاگری رۆیشتن.

رووسەکان ئارداشس و هەر چوار سوارەکەیان دەسـتگیر کـردن و بردیانن بۆ ئێریڤان جلە کوردییـەکانیان لەبـەر داکـەندن و لـە شـاری تفلیس– دا لە بەندیخانەیان توندکردن. فەرماندەی هێزەکانی کورد، بە نامەیەك داوای لە رووسەکان کرد کە گیراوەکـان ئازادکـەن. چـەند رۆژێك دوای ئەوە. سوارەکانی کورد واتە چوار سـوارە گیراوەکـە بـۆ ئێریڤـان بـانگ کـران و لـە دوای پێدانـەوەی جـل و بەرگـەکانیان گەڕانەوە بۆ ئاگری. فەرماندەی کورد لە نامەی دووهـەمیدا داوای لـە رووسـەکان کـرد کـە ئارداشسـیش ئازادبکـەن، ئـەم نامەیـە بـەهۆی کۆمـەڵێك سـواری کـوردەوە بـۆ رووسـەکان رەوانـە کـرا، بـەلآم ئـەم کۆمەڵـە سـوارە لەسـەر سـنوور لەگـەڵ پاسـەوانەکانی سەرسـنووری رووس پێکا هەڵپژان تەقەیان لێکردن. سوارێکی کورد بریـندار بـوو و ناچاربوون بەبێ ئەوەی کە نامەکە بگەیەنن گەڕانەوە.

لەدوای ماوەیـەك لـە وەلآمـی رەفتـاری رووسـەکاندا کۆمـەڵێکی پێکهاتوو لە سوارەکانی ئاگری بەرەو شارێکی ئەرمەنی کە لە بەشی باکووری خۆرئاوای ئیغدیری بەشی رووسیا بوو و لە کەناری رووباری ئاراسدا هەڵکەوتبوو، رۆیشتن. لـە تـاریکی شـەودا بەرەشاشـەکانیان

ئاگر بارانیان کردن. لە دواییدا زانرا کە ئارداشس دوور خراوەتەوە بۆ سیبریا.

لە ناوەڕاستی هاویندا مەمو و نادر بەگ کوڕانی کور حسەین پاشای سەرۆکی هەموو خێڵی حەیدەران لەگەڵ دوو برای تریاندا و برازایەکیان لە سووریەوە ڕایانکرد و هاتنە نێو سنووری وڵاتی تورکیە لە دوای بڕینی ناوچەکانی مەدیاد- بشیری- غەرزان و لە دەوروبەری مووش تێپەڕین، لە دوای ئەوەی لە ئەشکەوتێکدا سێ کەسیان بە دەستی هێزەکانی تورك گیران و کوژران خۆیان گەیاندە ئارارات، کور حسەین پاشای سەرۆکی خێڵی گەورەی حەیدەری، بە نفوزترین سەرۆکی کوردی ناو چەی مێژوویی ئاراراتیانی دەوروپشتی ویلایەتی وان حاجی مووسا بەگی هاوڕێشی کە سەرۆکی ژێرو بەبڕشتی ویلایەتی مووش و لە بنەماڵەی دێرینی گەورە پیاوانیمووش بوو. ئەم دوو سەرۆکە لەکاتی پێکهێنانی کۆمیتەی ئیستقلالی کورد لەگەڵ خالید بەگی جەبرانی لەگەڵ سەرۆك کۆمیتەکەدا هاو پەیمانبوون.

کاتێك کە ئیحسان نوری لاو بوو، لەگەڵ خالید بەگی جەبران لە دژی تورکەکان شۆڕشیان بەرپاکردبوو. لە دوای تێکشکانی ئەم ڕاپەڕینەیان و دەستگیرکردنی سەروان عەلی ڕەزا بەگی بتلیسی، حکوومەتی تورك، خالید بەگیان لە ئەرزەرۆم دەستگیر کرد. خالید بەگیان لەگەڵ یەکەیەکی سوارەی سەربازی لە ڕێگەی قراکۆسەوە، ئەرجیش، پاتنوس، عادل جەوازەوە برد بۆ بەدلیس لەوێ زیندانییان کردبوو. ڕێگەی ئاسایی ئەرزەڕۆم بۆ بەدلیس لە جانیسەوە دەڕۆیشت. کە سەرزەمینی خالید بەگ بوو، تورکەکان نەیان دەوێرا

ناو براو لەوێوە بەرن. لە کاتێکدا کە خالید بەگ گەیشتە ئەرجیش توانی پەیامێك بە کور حسەین پاشا بگەیەنێت کە لە دەستی تورکەکان رزگاریکات ئەم ناوچەیە لە ژێر دەستەلاتی خێڵی حەیدەران دابوو. رزگار کردنی خالید بەگ لەلایەنی کور حسەین پاشاوە دژوار نەبوو، بەڵام ئەو نەیویست خۆی گیرۆدە بکات.

لە کاتی راپەرینەکەی شێخ سەعید، حاجی مووسا بەگ و خالید بەگی جەبرانی لە زیندانی بەدلیسدا گیرابوون. بەلام کور حسەین پاشا هەر وەکو جاران لەناو خێڵەکەی خۆیدا رۆژگاری بەسەر دەبرد. ئاگری پشێوی لەگەڵ راپەرینی خێڵەکانی جەبران، زەرکان، حەسەنان، گەیشتبووە سەر سنووری خێڵی حەیدەران، داوایان لە حسەین پاشاکردبوو کە ئەمەکداری و پەیمانی خۆی بەجێ بێنێت یانی پەیوەندی بە شۆڕشگێڕەکانەوە بکات، ناوبراو سەرەڕای ئەوە کەدراوێکی هێجگار زۆری هەبوو شەیدای ئەسکەناسی تورکەکان بووبوو، دڵی بۆ لیرەی تورکی لێیدەدا بە بیانووی ئەوە کە چاوەڕوانی وەلامی ئیسماعیل ئاغا واتە سمکۆ دەکات پاڵی بە رۆژگارەوە نابوو، تاکو شکان و گرفتاریی شێخ سەعید هاتە پێشەوە. لە دوای ئەم تێکشکانە ژمارەیەك لە جەنگاوەرانی جەبران، زەرکان، حەسەنان کە بەرەو سنووری ئێران پاشەکشێیان دەکرد لە کاتی پەڕینەوە لە ناوچەی خێڵی حەیدەران بەرەو رووی بەرهەڵستکارانی حسەین پاشا بوونەوە. حسەین پاشا ماوەی حەوت رۆژ رێگەی بە شۆڕشگێڕەکان گرت، لە ئەنجامدا لە دوای چەند جەنگێك شۆڕشگێڕەکان رێگایانکردەوە و خۆیان گەیاندە سەر سنووری ئێران. لێرەدا بوو کە هاوکاریی حسەین پاشاو هێزەکانی

دوژمن ئاشكرابوو، بەلام مەردانی بێباك و نەتەوە پەرستی خێڵی حەیدەران لە چوار چێوەی ئەم لێكدانانەدا یارمەتیی شۆڕشگێڕەكانیان دەدا و هۆی رزگاربوونیان بۆ بەدی دەهێنان.

شتێك كە بووە هۆی بەدناویی ئەم خێڵە یەكەم كوشتنی دوو كەس بوو لە هەسنییەكان كەناویان زاهیرو بەشیر بوو. لە ئاوایی كەندال بەشك بە دەستی قاسو كندیك و دووهەم بەدەستەوەدانی دووكەسی دیكەی هەسنی بوو بەناوەكانی حەسەن زوبێرو شەمسەدین لەوەند. (لە نۆكەرەكانی سلێمان بەگ) بە جەندرمەكانی تورك. ئەم دوو كەسە رێگەیان ونكردبوو و چوو بوونە مالی بەدری بەگ. ناوبراویش بە حكوومەتی ئاباغانی راگەیاندبوو حكوومەتیش چەند نەفەرێك ژاندارمی ناردبوو لە كاتێكدا كە ئەم دوو كەسە لە ژوورێكی مالی بەدری بەگدا خەوتبوون گیران و ئەوەندەیان لێدان كە حەسەن زوبێر لە رێگەداو لە نێوان بەدلیس و غەرزان لە ژێر زەبری قەمچی جەندرمەكاندا گیانی لە دەستدا، بەلام شەمسەدین چونكە بەهێز بوو نەمرد لە دوابیدا بۆ ماوەی سێ سال لە ئەزمیردا لە بەندیخانەدا بوو. لە پاش سێ سالەكە لە بەندیخانە هەلات خۆی گەیاندە ئارارات و لە دەستەكەی فەرزندە بەگدا ئەركی نیشتمانیی خۆی بەجێ دەهێناو درێژەی پێدەدا. بەلام پیاوە نەجیبەكانی دیكەی خێڵی حەیدەران بەو گیانبازییانەی كە لە دواییدا لە رێگەی ئازادیی گەلدا نیشانیان دا و بەو خوێنانەش كە پێشكەشی ئازادییان كرد ئەم دوو ڕووداوە شەرمەزارییەیان شۆرییەوە.

كور حسەین پاشا بە بەشداری نەكردنی لەگەل بزووتنەوەی نەتەوەیی تایەفەی حەیدەران بەلكو خێڵە گەورەكانی وەكو، سیلان،

جەلالی، سپیکاو تایەفەکانی دیکەی کوردی لە شوێنی خۆیانا ڕاوەستاندبوو.

کور حسەین پاشا بە نژاد کورد بوو. بوونی ناوی کوردیش بۆ ئەو پێویستی بە سزادان بوو و بە خزمەت کردنی دەوڵەت نەیدەتوانی لە سزادان ڕزگاری کات. لەم ڕووەوە لەدوای نەمانی مەسەلەی شێخ سەعید لە ناوەڕاستی زستاندا. ناوبراو لەلایەنی دەوڵەتەوە گیراو لەگەڵ خێزان و منداڵەکانی بە شێوەیەکی ناشیرین بۆ ناوچەی خۆرئاوای تورکیە دوور خرایەوە.

حاجی مووسا بەگیش بە هۆشیاریی کەم وێنەی خۆی لەبەندیخانەی بەدلیس لە دوای دادگایی کردنی لە کوشتن ڕزگاری بوو و فەرمانی دوور خستنەوەی بۆ دەرچوو. ئەم دوو کۆنە هاوڕێیە لە ئۆردووگای دوور خراوەکانی ئایدین یەکتریان دۆزییەوە. لەبەر ئەوەش کە هەردووکیان ڕۆحی ئازادییان هەبوو نەیاندەتوانی خۆیان لەگەل دوور خستنەوەکەدا ڕابێنن پێکەوە بڕیاری ڕاکردنیان دا. حسەین پاشا ماڵ و منداڵەکانی دایە دەست دوو کوڕی خۆی. بۆ خۆی و حاجی مووسا بەگ و کوڕەکانی دیکەشی چەند ئەسپ و تفەنگی پەیدا کردو بە شەو لە شار چوونە دەرەوەو ڕێگەی سووریەیان گرتە بەر. لە سووریە بوون بە میوانی حاجو ئاغا کە یەکێك بوو لە سەرۆکە شۆڕشگێڕەکان و سەرۆکی خێڵی هەڤیرکا بوو لە ناوبراوەوە زانیارییان سەبارەت بە کۆمیتەی خویبوون بە دەست هێنا، دۆستی و وەفاداریی خۆیان بۆ کۆمیتەی ناوبراو بە نووسین ڕاگەیاند و بە هۆی نامەبەرێکی تایبەتییەوە ڕەوانەی دەستەی ناوەندییان کرد. لەوێشدا بەپێی فەرمانی ڕێکخستنەکانی خۆیبوون

بەرەو ئێران ڕۆیشتن. لە شاری مووسڵدا بە پێی ئەو پەیوەندییە باشانەی کە لە نێوان دەوڵەتی گەورەی بەریتانیاو تورکیا هەبوون. بەر بە ڕۆیشتنیان گیرا، ناچار سەرلەنوێ گەڕانەوە بۆ سووریە. حاجی مووسا بەگ نەخۆش کەوت. لە دوای ماوەیەك لە ماڵی حاجو ئاغا دڵە پڕ لە سۆزە نیشتمانییەکەی لە لێدان کەوت و هاوڕێکەی بە تەنها بەجێهێشت.

بۆ ئەنجامدانی فەرمانەکانی خۆیبوون چوار کوڕو کوڕەزایەکی حسەین پاشا لە ناو کوردستانی تورکیەوە و هەروەها خودی حسەین پاشاو کوڕەکەی عەدۆ و خوشکەزایەکی و نەوەیەکی تری. بەناو خێڵەکانی سەر سنووری باشووری تورکیەدا چوون بۆ ئارارات. لەدەستەی یەکەمیاندا شەش کەسیان لە ئەشکەوتێکدا لە لایەنی هێزەکانی دەوڵەتی تورکیەوە گەمارۆ دران و کوژران، دوو کەسی دیکەش مەحموود و نادر ڕزگاریان بوو. خۆیان گەیاندە چیای ئاگری کە پەناگاو مەکۆی ستەم دیدەکان بوو.

خودی حسەین پاشا لەبەر ئەو خەیانەتانەی کە بەرانبەر بە شۆڕشگێڕەکان کردبووی لەگەڵ هاوسەرەکانیدا لە شەوێکدا بە گوللەی کوردەکان گیانیان لە دەست دا. ئەو سەروەت و سامانەی کە بۆ پاراستنیان کەوتبووە زەلکاوی خەیانەتەوە لەم چەند خولەکەی کۆتایی ژیانیا هیچ ئەمەکدارییەکیان بۆ نیشان نەدا. لە کاتێکدا کە خاوەنی دەیان هەزار لیرەی عوسمانی بوو لەگەڵ کوڕەکانیا بەبێ کفن مردن و لە ناو هەزاران بنەماڵەی خێڵی حەیدەری یەکێك لە ژوور سەری نەبوو، کەسێك لاشەکەی بە خاك نەسپارد، بوو بە خۆراکی دڕندە هەردییەکان. بەم شێوەیە مێژووی

نۆکەرایەتی بۆ دەوڵەتی تورکیە و خەیانەت کردن بە گەلی کورد و پاداشی کردەوەکانی کور حسەین پاشا پێچرایەوە.

(ئەگەر خۆیبوون چاو پۆشیی لە رابردووی خیانەتکارانەی حسەین پاشای کرد و بەخشی، بەڵام مەعلووم نییە کە خواوەند بیبەخشێت، هەتاهەتایە مۆری خەیانەتکاریش بە ناوچاوی بکوژەکانیشییەوە ئەمێنێتەوە.

لە راستیدا کاتێك کە کور حسەین پاشا. سووریەی بە جێهێشت بە ناو خێڵە کوردەکاندا تێپەڕی و گەیشتە بارزان، بووە میوانی شێخ ئەحمەدی بارزانی، برا گەورەی تێکۆشەری گەورەی کورد مەلا مستەفا. کور حسەین پاشا، هەرلەوێ چاوی بە مەدنی کوڕی حاجی مووسا بەگ و مامە کەشی نۆح بەگ کەوت. چەند رۆژێك لە بارزاندا پشوویان دا. ئەو رۆژەی کە بەرەو ئاگری رۆیشتن. مەدنییش دەیویست بڕوات بۆ ئارارات. لەگەڵ چەند سوارێکی چەکداری کور حسەین پاشادا بوون بە هاوڕێ، ئەمانە دەبوایە بە شێوەیەکی نهێنی لە سنووری عیراقەوە تێپەڕن. لە شەوێکدا لە ناوچەیەکی چیاییدا مەدنی و پیاوەکانی نەخشەیەکی ئەهریمەنانەیان دارشت، حسەین پاشاو هەموو سوارەکانی حسەین پاشایان لە خەوا کوشت و چوونەوە بۆ تورکیە. کاتێك کە شێخ ئەحمەدی بارزانی ئەمەی بیست دەستی بە لێکۆڵینەوەی رووداوەکە کرد و بۆی دەرکەوت کە برای حاجی مووسا بەگ. بە نهێنی پەیوەندیی بە حکوومەتی تورکیەوە هەبوو، بە کوشتنی کور حسەین پاشا دەیانویست لە لێبووردنێکی گشتی بەهرەمەندبن. هەر بەم نیازەوە بوو مەدنی ویستی لەگەڵ کور حسەین پاشادا ببێتە هاو سەفەر.

شێخی بارزان لە تۆڵەی ئەو خەیانەتەدا نۆح بەگی لە دار دا. نەیهێشت بەم کارە ئابڕووبەرانەو خەیانەتە سوود لە لێبوردنی تورکیە وەربگرێت. لە دواییدا پێیان ڕاگەیاندم، کە بەهران نەوەی کور حسەین پاشا بە کوشتنی مەدنی تۆڵەی باپیری خۆی سەندەوە).

لە کۆتایی هاویندا لە نزیکی ئارارات لە نێوان پاسەوانانی سنووری ئێران و تورکیەدا ناکۆکییەك ڕووی دا، سەربازە ئازاکانی ئێران پەلاماری پۆستێکی سەربازی تورکیەیان دابوو، بەرزاییەکیان لێگرتبوون، دلاوەرە کوردەکان لەکاتی ڕووداوەکە پەلەیان کرد بۆ یارمەتی دانی ئێرانییەکان. فەرماندەی پاسەوانەکانی سەر سنووری تورکیە هەستی بە خراپیی بارودۆخەکە کرد، بەپەلە لەگەڵ ئەفسەرە ئێرانییەکاندا کەوتبووە گفتوگۆکردن، ناکۆکییەکەی چارەسەرکرد.

ئەم پێشهاتە ڕێکەوت بوو لەگەڵ ڕۆژێك کە فەرماندەی کورد بۆ سەردانی لقەکانی خۆیبوون لە ئارارات چوو بووە دەرەوەو هەر لەم کاتە دابوو کە شێخ عەبدولقادر خەریکی گەڕانەوەبوو بۆ شوێنی زستانەی خۆی، لە ناوچەی چیای تندروك کەوتە بەر پەلاماری هێزەکانی دەوڵەتی تورکیە. خێڵ و کەلو پەل و مەڕوماڵاتی خۆی بەجێهیشت و بە زەحمەتێکی زۆر ماڵ و منداڵەکانی خۆی ڕزگارکردن. بە حاڵێکی پەرێشانەوە پەنای بە ئارارات برد. بەداخەوە ساڵحی برازای و شێخ یاسینی کوڕی مامی و ژمارەیەکی دیکەش لە ژن و پیاو کوژرابوون، بەم شێوەیە دوو بارە شێخ پەیوەندیی بە شۆڕشگێڕەکانی کوردەوە کرد. پێش ئەوەی زستان لە نێوان هەردوو بەرەی دژبەیەکدا تەقە وەستانێکی کاتی ڕابگەیەنێت.

خێزانی فەرماندەی کورد کە لە ئەنجامی گفتوگۆکردن، لەگەڵ دەستەی نێردراوی تورك کە لە نزیك پردی شێخلو بە پەساپۆرتەوە لە تورکیەوە چووبوون بۆ سووریە گەیشتنە ئارارات، ئەم کارە کە بە رووالەت گرنگ نەبوو توانای رێکخستنەکانی خۆیبوونی نیشان دەدا. هێشتا یەکەم هەفتەی گەیشتنیان کۆتایی نەهاتبوو. فڕۆکە جەنگییەکانی تورك لە ئاسمانی کوردئاوادا دەرکەوتن و بەبۆمباو ئاگری شەستیرەکانیان ئەرکی بەخێرهاتنیان ئەنجام دا، ئەم کارەیان چەند رۆژێك یەك لە دوای یەك دووبارە کردەوە.

تەمەر شەمکیش دووبارە گەڕایەوە بۆ ئارارات ئەمجارە بێجگە لە چەرخەی برای چەند دلاوەرێکی دیکەش وەکو ئۆسی و فەتو کە لە بێباکی و جەنگاوەریدا بەڕاستی بێوێنە بوون لەگەڵدا بوو. شێخ تاهیر لاوێکی ئازاو گیانبازی کورد بوو لەگەڵ براکەیدا هاتن بۆ دێی عەبدولقادر و پەیوەندییان بە شۆڕشگێڕەکانی ئاراراتەوە کرد.

بەفر بارین بێدەنگیی راگەیاند.

لە ئاراراتدا رۆژنامەیەك بە زمانی کوردی لە ژێر ناوی ئاگری بڵاوبووەوە و ئەم رۆژنامەیە لەگەڵ نەبوونی کاغەزیشدا بە گوێرەی پێویست ژمارەی لێ بڵاودەکرایەوە،لە لایەکی دیکەشەوە چونکە چاپخانە نەبوو. رۆژنامەکە بە شێوەی ژلاتین دەردەچوو.

سەربازانی تورك هەستیان کردبوو کە لە بەرانبەر دوژمنێکی بێباکدا رووبەڕووبوونەتەوە لەبەر ئەمە گەلێك دەترسان. ئاشکرابوو کە خەوی شەوانەیان نەبوو چونکە زۆربەی شەوەکان تەنها بە خەیاڵی ئەوەوە کەدەکەونە بەر هێرش و پەلاماری شورشگێڕەکان فیشەکیان بە تاریکیی شەوەوەدەنا. بۆمبایان دەهاوێشت لە

شوێنێکەوە کە دەنگی گوللەیەك دەبیسترا. شوێنەکانی دیکەش بە چاو لێکەری بە دوای ئەواندا تەقەیان دەکردو درێژەیان بە تەقەکانیان دەدا. ئەمەش بۆ ئاراراتییەکان لەشێوەی یاریی ئاگر بازیدا بوو.

لەم زستانەدا بوو کە سەرکوتکردنی شێخ محەمەد حسەسووری کە سەر بە حکوومەتی تورکیە بوو لە نێو فرسەخی شاری بایەزیدا دادەنیشت و بەهاندانی فەرماندە سەربازییەکانی سەر سنووری تورکیە. لەگەڵ تاقمە تایبەتییەکەی خۆی بە نهێنی دەچوونە نێو خاکی ئێرانەوەو ئێرانییەکانیان رووت دەکردەوەو دەگەڕایەوە بۆ تورکیە. بۆ بنبڕ کردنی ئەمکارە هەنگاو نرا. ژمارەیەك پیادە بە سەرۆکایەتیی رەسوولی شێخ عەبدولقادر چوون بۆ سەر دێی ناوبراو شێخ محەمەد کوژرا لە کاتێکدا کە شێخ محەمەد لە لایەکەوە لە تایفەو خزمە نزیکەکانی برو حسکی بوو و لە لایەکی دیکەشەوە لە ئامۆزاکانی ماڵی شێخ عەبدولقادر بوو. کۆمیتەی خۆیبوون فەرمانی بۆ هەموو لقەکانی خۆی دەرکردبوو پێی راگەیاندبوون: (شۆڕشگێڕەکانی کورد نابێت تەنها سوودە رامیاری و ئابوورییەکانی دەوڵەتی شاهەنشاهی ئێرانیان بەلاوە گرنگ بێت بەڵکو دەبێت بە کردەوەو دڵسۆزانە ئەم مەسەلەیە بسەلمێنن. بەم هۆیەوە بە دابینکردنی بێلایەنیی دەوڵەتی ئێران قایل نەبن، بەڵکو لە ئەنجامدا دەبێت نیشانەی راستی و دۆستایەتیی مەعنەوی و رامیاریی دەوڵەتی ناوبراویش بەدەست بێنن).

ئەم ئاگادارییە کە بە مۆری رەسمیی کۆمیتەی ناوەندی خۆیبوون مۆر کرابوو. دوور نییە کەوتبێتە بەرچاوی کاربەدەستانی دەوڵەتی ئێرانیش.

ئەم فەرمانە بە تەواوی راپەڕێنرا بە شێوەیەك کە تاکو تێکشکانی رێکخستنەکانی ئارارات بچووکترین کارێك کە پێچەوانەی فەرمانی سەرەوە بێت، لە لایەنی ئاراراتییەکانەوە رووی نەدا، بە جۆرێك کە هێزەکانی ئارارات لە درێژەی جەنگ و پێکدادانیاندا لەگەڵ دەوڵەتی تورکیە وەکو لەشکرێك کە پاراستنی سنوورەکانی ئێرانی پێسپێردرابێت رەفتاریان دەکرد، لەبەر ئەمە مافی ئەوەیان هەبوو کە چاوەڕوانی پاداشتی چاکەیان لەدەوڵەتی ئێران هەبێت. بە داخەوە رووداوێك هاتە پێشەوە کە لە لاپەڕەکانی دواوە دەیخەینە بەرچاوی خوێنەواران کە پێچەوانەی ئەم چاوەڕوانییە بوو.

* * *

سەرەتای یەکەم مانگی بەهار بوو. هێشتا زستانی ئارارات کۆتایی نەهاتبوو. شەوێك هێزەکانی حکوومەتی تورکیە لەگەڵ ژمارەیەك لە خێڵی کەکسۆیی دەوروبەری دێکەی شێخ عەبدولقادریان گەمارۆدا، دێی شێخ لە کۆتایی بەشەکانی خۆرئاوای ئاراراتدا، لە ناوچەیەکی تەختاییدا هەڵکەوتبوو، بەشی باکوورو خۆرئاوایشی بە چیایە بەردینەکان کە وەکو دیوارێك سەریان لە ئاسمان دەسوو. سەرکەوتن بە سەریانا گەلێك ناهەموار بوو هاوسنوور بوو. دوژمن ئەم شوێنە سەختانەی داگیر کردبوو. بەیانی زۆر زوو لە کاتێکدا کە شێخ لەماڵەوە دەردەچوو درایە بەر دەسترێژ. دانیشتووان بە سەر سامییەکەوە لە خەو راپەڕین گوللەی

تفەنگ و شەستیر وەکو تاوە تەرزە بە سەر دێکەدا دادەباری، ئیتر ماوەی وتووێژو پرس و ڕا نەبوو. چاوەڕوانی کردنی یارمەتیش دەبووە هۆی زیانێکی زۆر....... تەمەر شەمکی و چەرخە و ئوسی و فەتوو شێخ تاهیر و رەسوولی کوڕی شێخ و کوڕە ئامۆزاکانیشی. عەلوی ئەزدی و چەند نەفەرێکی دیکەش لە شێخەکان بە جلوبەرگی شەوانەیانەوە بەبێ ئەوە کە ماوەی خۆ گۆڕینیان هەبێت. بە دەستێکیان چەکەکانیان و بە دەستەکەی دیکەشیان فیشەکدانەکانیان هەلگرتبوو لە ماڵەکانی خۆیان هاتنە دەرەوە. ئارارات لەماوەی ئەم شەش مانگەی دواییدا دووهەم جار بوو کەبێباکی و ئازایەتیی کوڕەکانی خۆی بە روخساری دوژمنانی کوردا بداتەوەو تۆڵەی سەرلێشێواندنی سەردەمە رابوردووەکانی بسێنێتەوە.

قارەمانەکان وەکو بزنە کێوی لە بەردێکەوە بازیان دا بۆ بەردێکی دیکە. لە ماوەیەکی کەمدا خۆیان گەیاندە یەکەم هێڵی دوژمنی سەرەڕۆ. دوژمن چاوەڕوانی ئەمەی نەدەکرد، خۆیان ونکرد. ئەو ئەفسەرو سەربازانەی کە لە لای دژە هێرشەکەوە بوون گیانیان بە یەزدان سپارد. تێکشکان تەواوی هێڵەکانی جەنگی گرتەوە. تاکو یارمەتیی کوردەکان لە پشتەوە گەیشت. بەشێك لە تورکەکان بەرەو مۆڵگاکانیان راونرابوون و بە شێکی دیکەشیان پەردەوازە بوو بوون. چەند کەسێکیشیان لە ترسی گیان خۆیان هاوێشتبووە ناو ئەو هۆڕو زۆنگاوە کە لە نێوان هێڵی هەردوو لادا بوو، لە ئەنجامدا هیچ شوێنەوارێکیان لێ نەدۆزرایەوە. چونکە شێخ تاهیر لەگەڵ ژمارەیەك

لە شۆڕشگێڕەکانا بە شێوەیەك پەلاماریان دابوون کە ڕێگەی پاشەکشێی سەربازەکانیان گرتبوو. لە کاتی هەڵاتندا ژمارەیەکیان فیشەکدانەکانیان فڕێدابووە ناو هۆڕو زۆنگاوەکان تەنها چەند فیشەکدانێکیان بۆ کوردەکان دۆزرایەوە.

کوردەکان بیست سەربازیان بە دیل گرتبوو، ژمارەیەکیش چەك و فیشەکیان دەست کەوت. لە ناو ئەم چەکانەدا چەند شەستیرێکی سووکیان تێدابوو. کاتژمێرێك دوای ئەوە فەرماندەی لەشکری شۆڕشگێڕەکان و برو حسکی لەگەڵ شێخ عەبدولقادر لەبەر دەرگای ماڵی شێخدا دانیشتبوون. گوێیان لە بەسەرهاتی جەنگەکە دەگرت جەنازەی ئەفسەرێکی تورك لەگەڵ جەنازەی کوردێکدا هێنان، ئەم کوردە کوژراوە هەمان تەمەر کەسکۆیی بوو کە ماوەیەك لەوەو پێش وتبووی من (تورکی کوڕی تورکم).

لە بەردەم جەنازەکاندا برو حسکی بە دەربڕینی ئاخ و کەسەرەوە وتی خواش تاقەتی جارانی نەماوە، خائینەکان زووتر بە سزای خۆیان دەگەیەنێت. بڕیار درا کە ئەم دوو برا تورك و کوردە پێکەوە لە گۆڕێکدا بشارنەوە، تاکو هیچ کاتێك لەیەك جیا نەبنەوە، تەمر کەسکۆیی، لە باتی ئەوەی بە پاداشتی گیان بە ختکردنی شانازی بۆ منداڵەکانی خۆی بە دەست بهێنێت کەچی ناوی شەرمەزاریی بە یادگار بۆ بەجێهێشتن.

ئاراراتییەکان دەیانویست مافی داگیرکراوی کورد بەدەست بێننەوە، تەمر کەسکۆیی کوردبوو. مەسەلەی پێشێلکردنی مافی خۆی و خێڵەکەی و منداڵەکانیشی لە ئارادا بوو. دیاربوو کە ورە بەرزو بێباك بوو کە هاتبوو بۆ جەنگ، بەڵام نەزانی و بەد سروشتی

چاوی زیرەکی و وریاییـان وا بەسـتبوو کـە یارمـەتیی دوژمنـانی بەرگریکەرانی مافی خۆی ئەدا.

دیلـە تورکـەکان نـێردران بـۆ ناوەندی سـەرکردایەتی. لـە دوای شەوێك پشوودان لەگەڵ چەند کەسێکدا نـێردران بـۆ سـەر سنووری ئێران. لە نزیك پۆستێکی سەر سنوور لە خاکی ئـێران بـەرەڵا کـران. لە کاتی بەڕێ کردنیان لە کـورد ئاوا. یـەکێك لـە سـەربازە دیلـەکان گۆرەوییەکانی گەلێك کۆن و داڕزاو بوو، هوریك کە نـاوی پـیرەژنێکی کورد بـوو، گۆرەوییـەکانی پێـی خـۆی داکـەندن و دای بـە سـەربازە تورکەکە، تاکو لە رێگەدا سەرمای نەبێت. ئەمـە نموونەیـەك بـوو لـە نەفس بەرزی و رۆح گەورەیی و سروشت پاکیی کـورد. سـەمبولێکی بەرجەستەی رەفتاری کورد بوو بەرانبەر بەدیلەکان.

ساڵی (١٩٣٠) گەیشت ئەم ساڵە پێنجەمین ساڵی ئازادیی ئارارات بـوو. درێـژەدان بـەم بارودۆخـە لـە ئاراراتدا بـۆ تورکـەکان هـەرس نەدەکرا. نەتەوەی کورد هۆشیار بووبووەوە، میراتی باب و باپـیرانی خۆی دەویست. گوێی بە لێبووردنی دواخستن و بەخشینی خـەڵات و پەیمانەکانی دیکەی نەدەدا. ئاراراتییەکان دەیانوت : ( لێبووردن بـۆ تاوانباران شایستەیە، بەڵام ئێمە تاوانبار نین، ئێمە مافی داگیرکراوی مرۆیـی خۆمـان دەوێـت نـەك لێبـووردن، بــەڵکو ئێمــە دەســتەڵاتی بەخشینمان هەیە).

حکوومەتی تورکیە تەنها بە هێزی سەربازیی خۆی، بەو شێوەیە کە چەندین جار تاقیکردبووە، توانای باشـکردنی کێشـەکەی نـەبوو، پێویستی بە کۆمەکی دەرەکی بوو. شوێنی جوگرافیایی ئـارارات بـە شێوەیەك بوو، کە لە نێوان سنوورەکانی ئێران و رووسیە و تورکیەدا

هەڵکەوتبوو. هەنگاوە رامیارییەکانی حکوومەتی تورك توندتر بوو بە راگەیاندنی هاشەو هووشەی دوور لە راستیی خۆی، دەوڵەتی شوورەویی بۆ لای خۆی راکێشابوو. لە ئەنقەرەشدا لە نێوان وەزیری دەرەوەی تورکیە و باڵوێزخانەی دەوڵەتی شاهەنشاهی ئێراندا بۆ بەستنی پەیماننامەیەکی دۆستانە کە بە زیانی ئاراراتییەکان تەواو دەبوو، دەرگای گفتوگۆکردن کرابووەوە. لەم رووەوە لە تارانیشدا لە لایەنی تورکەکانەوە هەنگاو لە دژی ئاراراتییەکان نرا بوو، ئاراراتییەکان بە وردبینی و گرنگییەکی تایبەتی بە دوای گفتوگۆکانی نێوان ئێران و تورکیەدا دەگەڕان. هەرچەندە دەوڵەتی ئێران دەیزانی و نیازی ئەوەی نەبوو. کە لە دژی ئاراراتییەکان هەنگاوێك بنێت. کە وەکو بە تەشوێیەك رەگ و ریشەی خۆی ببڕێتەوە وابوو، بەلام لە چالاکییەکانی دەستە نەناسراوەکان کەبە سوودی تورك کاریان دەکرد بێ ئاگانەبوون.

رۆژنامەی ئاگری کە بلاوکەرەوەی راوبۆچوونی رێکخراوە ئاراراتییەکان بوو لە سەروتارێکی خۆیدا. لە ژێر ناونیشانی ((بەیەك کەڤر دوو تەیر))یانی (بەبەردێك دوو چۆلەکە) روونی کردبووەوە کە دەوڵەتی تورکیە دەیەوێت لە نێوانی کوردو ئێران، لەیەك نەگەیشتنێك بێنێتە کایەوەو دەوڵەتی ئێران لە دژی شۆڕشگێڕەکانی کورد هانبدات و ئاژاوەی کوردەکانیش بخاتە ناو ئێرانەوە، هەم خۆی لە جەنگی کورد تاڕادەیەك ئاسوودە دەکات هەم کوردو فارس یانی ئەم دوو برا هاو نژادە بەدەستی یەکتر بە کوشت بدات، هەردوو لا بێهێز و لاواز بکات تاکو داگیرکردنی ئازربایجانی بۆ ئاسانتر بێت. خۆشبەختانە کاربەدەستانی ئارارات هۆشیار بوون. هیچ

بیانوویەکیان نەدا بە دەست پیاوەکانی تورکیەوە تاکو نیازە گڵاوەکەیان پێ بهێننە دی.

فڕۆکەکانی تورکیە هەموو ڕۆژێك بەیانی زوو دیارییەکیان پێشکەش بە ئاوایی کوردئاوا دەکرد. هێشتا خێڵەکان بەرەو کوێستان نەڕۆیشتبوون، فەرماندەی کورد لەگەڵ شێخ عەبدولقادر و سەد سوارێك بۆ سەردانی بەرەکانی باکووری ئارارات ڕۆیشتن، گەیشتنە ناو دەشتی ئیغدیر ئەمە یەکەم جار بوو کە ئاڵای کوردستانی ئازاد بە دەستی سوارە بێباکەکانی کوردەوە لەم دەشتە دا دەشەکایەوەو لە سەر ڕێگەی ڕۆیشتنیان ژمارەیەك دێهاتی تورك زمان، کە لەوناوچەیەدا نیشتەجێ بووبوون سەریان پێدانەوێنرا، ئاراراتییەکان دەوارەکانیان لە شوێنە جۆراوجۆرەکانی چیاکەدا هەڵدابوون. هێشتا سێ ڕۆژ تێنەپەڕیبوو هەمووشیان نەیان گوێزابووەوە کە دەنگی گوللە لە بەشی خۆرئاوای ئاراراتدا لە سەر ڕێگەیەکدا. کە بەشی باشووروو باکووری ئاراراتی بەیەکەوە دەبەستەوە دەبیسترا. بە دوای ئەوەشدا چەند فڕۆکەیەکی تورك دەواری ئاراراتییەکانی بە توندی بۆردمان کرد. لە دواییدا زانرا کە تورکەکان بە فەوجێکی پیادە و بە دوو تۆپی چیاییەوە لە قباق تەپەکە (چیایەك بوو لە بەشی دامێنی خۆرئاوای ئاراراتدا) چادریان هەڵدابوو. ئەم چیایە وەکو قەڵایەك بوو، تەنها ڕێگایەکی باریکی هەبوو. بە دەستڕێژی پیادەکان هیچ زیانێك نەکەوتەوە، بەڵام بە بۆردمانی دەوارەکان خێزانی فەرماندەی کورد بریندار و بەرخ لەوەڕێنێکیش بە ناوی محەمەد کوژرا. ئەمە سەرەتای هێرشی گەورەی تورکەکان بوو بۆ چیای ئارارات.

ئەفسەری تورك زوهدی گویڤەن ئاوای نووسیوە: (هەموو هێزەکانمان لە دژی ئەم چیا بڵندانە ڕێکخست و لە کاتێکدا گەیشتینە ئەوێ ڕوانیمان تەنها کوردێکی لێنەماوە).

فڕۆکەکانی تورك بە پێچەوانەی ساڵەکانی رابوردوو هەموو ڕۆژێك لە ئاسمانی ئاراراتدا، دەردەکەوتن. بۆمباو گوللەکانیان بەسەر ژن و منداڵی بێتاواندا دەباراند، بەڵام چونکە لە ترسی گوللەی شۆڕشگێڕەکان لە ئاستێکی زۆر بەرزەوە دەفڕین. لەلایەکی دیکەشەوە ئامۆژگاریی پێویست، بە دانیشتووان ڕاگەیەنرابوو، زیانی گیانی هیچ ڕووی نەدەدا. زیانی ئاراراتییەکان تەنها بریتی بوو لە زیانی ئاژەڵ، حکوومەتی تورکیە چالاکیی ڕامیاری و سەربازیی پێکەوە لە دژی ئاراراتییەکان دەست پێکردن. فەرماندەکانی خۆی گەیاندنە نزیکی ئارارات. درێژەی بە کۆکردنەوەی هێزەکانی خۆی دا، لەلایەکی دیکەشەوە دەوڵەتی شووروەویش ژمارەیەکی زۆر سەربازی لە بەرانبەر سنووری ئێران و ئاراراتدا کۆکردبووەوە. حکوومەتی ئێران ناوچەی ماکۆ (پشت ئارارات)ی پڕکردبوو لە سەرباز. ئاراراتییەکان هەرچەندە لە ئێرانەوە چاوەڕوانی جموجووڵی دوژمنانە نەبوون، بەڵام لە ئەنجامی وتووێژی ڕامیاری و سەربازیی نێوان ئێران و تورکیە نیگەران بوون، ئەمساڵە لە بەردەم دەستێوەردانەکانی حکوومەتەکانی ئێران و شوورەوی و تورکیە. بۆ ئاراراتییەکان گەلێك ترسناك بوو.

لەبەر ئەمە فەرماندەی کورد بڕیاری دا. ناوەندێکی بەرگری وەك ئارارات لە گەلی زیلان و چیای سیپان (سێبەر پان کە تورکەکان بە هەڵە پێیان دەوت سبحان) دروست بکات لە هەمان کاتیشدا

جموجووڵەکان فراوانتر نیشان بدات و نەخشەی سوپای تورك تێکوپێکبات. خێڵی دلێری حەیدەران بۆ قەرەبووی تاوانەکانی رابوردوویان خۆیان داوای ئەم هێرشەیانکرد، ماوەیەك لەوەو پێش بە هۆی هۆبەی ناوچەیی خۆیبوونەوە لە فەرماندەی کورد مۆڵەتی دەست بە کارکردنیان داواکردبوو. گەلی زیلان دووهەمین ناوچە بوو. کەلە جەنگی جیهانی ساڵی (١٩١٤) وەکو ئارارات رێگای هێزەکانی رووسیەی قەیسەری نەداو تاکو کۆتایی جەنگ خاکەکەی لە هەموو زیادەڕەوییەك پاراست، لەبەر ئەمە خۆیان تاقیکردبووەوەو لێهاتوویی و شایستەیی خۆیان سەلماندبوو.

لەگەڵ بوونی ئەم پێشینەیەشدا فەرماندەی کورد مافی ئەوەی هەبوو دەستپێشخەری بۆ ئەم کارە درێژ بکات بە تایبەتی ئەوەی کە دانیشتووانی ناوچەکە داوای ئەم هێرش بردنانەیان کردبوو. فەرمانێك کە سەبارەت بە رێکخستنی ئەم هێرشە دەرچوو سەرەڕای پاککردنەوەی گەلی زیلان لە هێزەکانی تورك ئازاد کردنی شارەکانی بارگیری ئەرجیش– ئەرنیس و تەنانەت عادل جەوازیش بە پێویست دەزانرا. ئەم ئەرکانە بە یارمەتیی ژمارەیەك جەلالی لەئەستۆی خێڵی حەیدەراندا بوو.

لەم کاتەدا هێزەکانی ئارارات هەم ئەوەشیان پێ سپێردرابوو. کە پۆستە بە هێزکراوەکانی تورکیە کە دەوروپشتیان گرتبوو لەناو بەرن و شارۆچکەی باشکەندیان لە باکوور و چیای تندروك لە باشوور بگرن و شارەکانی ئیغدیرو بایەزید بخەنە ژێر مەترسییەوە.

تەمەر شەمکی پێی سپێردرابوو کە لەگەڵ ژمارەیەك لە خێڵی شەمکان شاری قەلب بگرێت و فاغزمانیش بخاتە ژێر مەترسییەوە و

ڕێگای سارو قامیش بەرەو ئارارات بگرێت. لە فەرمانی هێرشەکەدا کاتی هێرش بردنەکەی هەموو ناوچەکان دیاری کرا بوو. ئەم فەرمانە چەند وێنەیەکی زۆری لەبەر گیرابووەوەو ئامادە کرابوو و بە سەرۆکە پەیوەندیدارەکان ڕاگەیەنرابوو.

ئەفسەری تورك زوهدی گویڤەن وێنەیەکی لەم بەیانەی دەست کەوتبوو، لە بارەیەوە ئاوای نووسیوە:

(حکوومەتی تورکیە فەرمانی هێرشی بۆ ئاگری دەرکرد و چەند یەکە یەکی سەربازی بەرەو بایەزید دەچوونە پێش. ژەنەڕاڵ ساڵح لە ئامۆرتاك تەواوی ئەفسەرەکانی بۆ ڕاگەیاندنی فەرمانی لەناوبردنی شۆڕشگێڕەکانی ئاگری کۆکردەوە. لە شکرکێشیی گەورەی تورکەکان دەستی پێکرد. هێزەکانی تورکیە قەباق تەپە کە لە خۆرئاوای ئاگریدا بوو داگیرکرد. فەرماندەی شۆڕشگێڕەکانی کورد ئیحسان نوری بە نۆرەی خۆی بەو خێڵانەی کە لە دەرەوەی ناوچەی ئاگریدا بوون پرۆگرامی ڕاپەڕاندنی چەند ئەرکێکی دوورو درێژی بۆ ڕەوانە کردبوون و ئەو خێڵانەشی وەکو بەشێکی هێزەکانی خۆی لێکردبوو. لە هێرشە گەورەکەدا وێنەیەك لەم پرۆگرامە واتە بەیاننامەیەیان دەست کەوتبوو. کە لە گیرفانی کوردێکی کوژراو دا دۆزیبوویانەوە. ئیحسان نوری وێنەیەکی بەیانەکەی بۆ کۆلۆنێل نەسرەت ئیبراهیمی سەرۆکی خێڵی ئادامان ڕەوانە کردبوو. لە لای ڕاستی نامەکەوە ناوی خۆیبوون لە ژێریا دەستەواژەی (جەمعیەتی نەتەوەیی کورد)((؟)) نووسرابوو، لەلای چەپی بەیانەکەشەوە ناوچەی چالاکیی سەرانسەری ئاگری باسکرابوو و لە ژێر ئەوەشەوە مێژووی (١٨ ی حوزەیرانی ١٩٣٠) نووسرابوو.

ئەم پرۆگرامە یا بلّێین بەرنامەیە لە حەوت خالّ کە بە زمانی کوردی نووسرابوون پێکهاتبوو. بریتی بوون لە :

١- لە (١١)ی حوزەیران تورکەکان پەلاماری ئاگرییان دا. قباق تەپەیان داگیرکرد و هێزەکانی تورکیە لەوێدا جێگیربوون. شەش فرۆکەی دوژمن لەم هێرشەدا بەشدارییان کرد و لە (١١ تا ١٨)ی حوزەیران هێزی ئاسمانیی تورکیە ئاسمانی ئاگرییان دەبەزاندو بۆمبابارانیان کرد. هێزەکانی ئێمە سێ فرۆکەی دوژمنیان خستە خوارەوە. یەکێکیان لە فرگەی بایەزید کەوتە خوارەوە، فرۆکەوانەکەشی پێکراو کوژرا.

٢- هێزە پیادەکانی ئاگری لە دژی هێزەکانی دوژمن بەرەو ئیغدیرو بایەزید هێرشیان دەست پێکرد. فەرمان بە لە شکری ناوەندی دراوە کە برۆنە چیای تندروك لە وێشەوە پەلاماری هێڵی هاتنی یارمەتیی تورکەکان بدەن، هەروەها پایەگاکانی کەرەسە جەنگییەکانیان داگیربکەن. بە چالاکیی پارتیزانیی هێزەکانی لای سووریەوەمان هاتبوونەوە ناوچەکانی خەرپوت و دەرسیم و هاتنە پێشەوەی هێزەکانی تورکیان راوەستاند.

٣- بەشی یەکەمی هێزەکانی خۆیبوون، بە یارمەتیی یەزدان پەلاماری تورکەکانیان دا.

ا- تەمەر ئاغا فەرماندەی گشتیی هێزی ئاسایشی ئاگری بە هێزەکانی ژێر دەستەلاتی خۆیەوە دەستی بە چالاکی کرد؛ لە سێی حوزەیران پەلاماری ینکەی حکوومەتی لە شاری قلب دا، لە دوای داگیرکردنی شارەکە، خێڵەکانی شمکان پەیوەندییان بەهێزە شۆرشگێرەکانەوە کردو پێکەوە گەیشتنە نزیکی پیرناوۆت.

ب- شەوی چواری حوزەیران وەلی بەگ، یارمەتیدەری سەرهەنگی تۆپخانە بە هاتنی خێڵەکانی گازگان (Gazgan)و زیلان بە هێزبوون چەند کۆمەڵێکی دیکەش پەیوەندییان پێوەکردن. ناوبراو لە پەلامارێکی گەورەو گرنگدا، شاری بایەزیدی رزگار کرد و لە هەمان رۆژدا هێزەکانی ئاگری پەلاماری ئەو هێزەی دوژمنیان دا کە لە ئاگریدا جێگیر بووبوون.

٤ - فەرماندەکانی ئەم دەستانە کە لە ئاوایی درێك کۆبووبوونەوە. لە چواری حوزەیران بە هێزەکانیان یەکەیەکی سوپای تورکیان چەککردو فەرمانگەی حکوومەتیان دا گیرکرد. چالاکییەکانی دوایی بەم شێوەیەی خوارەوە ئەنجام دران:

ا- بەشی ئەرجیش بە پشتیوانیی گەلی زیلان و لە دوای داگیر کردنی بنکەی حکوومەتی تورك بەرەو عادل جەواز رۆیشتن رزگاریان کرد. لەلای ئەخلاتەوە. تاکو توان و چیای نەمرود سوارەکانی کورد لە هاتوچۆ و گەشتا بوون.

ب- لەدوای ناردنی چەند یەکەیەکی پێویست بۆ بەشی ئەرجیش، رابەرەکانی گەلی زیلان تیپێکی ژاندارم و کارمەندانی تورکیان لە ناوچەکەدا گرت. لە خۆرئاواشەوە بەرزاییەکانی ئالأداغ و مەلەزگریان داگیرکرد.

یەکەکانی سوارەی کورد توانییان رێگاکانی پەیوەندی و هاتوچۆی قەراکۆسە بۆ مەلەزگر و قەراکۆسە بۆ ئەرجیش و مەلەزگر بۆ پاتنۆس بخەنە ژێر دەستەڵاتی خۆیانەوە.

پ- خێڵەکانی حەیدەران، دانیشتووانی پاتنوس و خێڵەکانی دیکە کە پەیوەندییان بە ئێمەوە کردبوو شاری پاتنوسیان رزگار

کرد و سوارە کوردەکان هاتوچۆی پەیوەندیی دوژمنیان لـە باکوورو خۆرهەڵاتی چیای سیپان و هەروەها بەرزاییەکانی– قوپ–و مووش و نـەمروودداغ کـە کـەوتبووە دەست تورکەکانـەوە بـڕی. بنکـەکانی تـەیارکردنیان و هـەروەها ئارنیسـیش کەوتـە ژێـر دەسـتەڵاتی کوردەکانەوە. ئەو رێگایانەی کەوانیان بە ئەرجیس و ئارانیسیان بـە سەرایەوە دەبەستەوە دا خست.

ت– هێزەکـانی نـاوندی لەلایـەن عەشـایەری میـلان و جـەلالی و هەروەها ئەو خێڵانەی کە لە ئاباغـاوە هـاتبوون، بـەهێز بـوو بـوون. شاری بچووکی بایەزید– یـان رزگـار کـرد. دەسـتەیەکی چـوار سـەد کەسـی بۆ بـەهێزکردنی هێزەکـانی ئامـادەکردن بـۆ چیـای تنـدروك رەوانـەکران تـاکو لـە گوێزاندنـەوەی کەلوپەلـە بـە جێماوەکـاندا یارمەتییان بدەن. شارەکانی وان، سـەرای، ئـاگرین و هـەروەها ئـەو رێگایانـەی کـە لـە وانـەوە بـۆ تـەریب و لـە هەکارییـەوە بـۆ سـەرای دەڕۆیشت خستنە ژێر هەڕەشەی خۆیانەوە.

ج– هێزەکانی ئەرجیش و ئارنیسیش لە چالاکییەکانی هێزەکـانی ناوەندیدا بەشداربوون.

چ– لە رۆژی هـەینی (١٤)ی حوزەیـران یارمـەتیدەری سـەرهەنگ نەسـرەت ئیـبراهیم ئاغـا سـەرۆکی خێڵـی ئادامـان، دانیشـتنێکی کوتوپڕی بە ئامادە بوونی عەلی بەگ میرزا و رەسـووڵ بـەگی زەلی و هـەموو سـەرۆکەکانی دیکـەی خێڵـەکانی قوتـان و حسـە سـووری پیکهێنا هێرشـێکیان بـۆ شـاری دیـادین بـرد، بـە تـەواوی دەسـتیان بەسـەر رێگـای نێوان قەراکۆسـەو بایـەزیدا گـرت و ئیـبراهیم ئاغـاو

حەمید بەگ تێکۆشان کە ڕێگای هاتوچۆی دوژمن لە گەلی تاهر بگرن.

ح- لەدوای گرتنی ئەم شوێنانە کە لەسەرەوە باسمانکردن، هێزەکانی ئەرجیش و پاتنوس و گەلی زیلان، بەشی زۆری هێزەکانی خۆیان لە ژوورووی ئەو شوێنەی کە دووتاق و مەلەزگر بەیەکەوە دەبەستەوە، جێگیر کرد. دەستەی هێنان و بردنی کەرەسەی پێویست لە نێوان ئارنیس و نورشات جێگیربوون.

٥ - بنکەی سەرەکیی فەرماندەیی کوردەکان لە ئاگریدا بوو بەڵام بەهۆی گەلێك هۆوە نەدەبووا دوژمن بەوردی شوێنەکەی پێ بزانێت).

زوهدی ویقەن. لە دوای ئاماژە بە بەرنامەی کاری خۆیبوون ئاوای نووسیوە:

(ئیحسان نوری هەڵاتووی سوپاو خایەن، فەرماندەیی گشتیی چالاکییە سەربازییەکانی لە ئەستۆدایە و هەروەها ڕێکخراوێکی لە شێوەی حکوومەت دامەزراندووە. لە کۆتایی ئاخرین لاپەڕەی بەرنامەی کارەکاندا لە ژێر ناونیشانی (فەرماندەی گشتیی خۆیبوون) واژۆی ئەوی پێوە بوو. لە بارەی هەڵوێست و ئەرکەکانی ئیحسان نوری وا دەردەکەوت کە ناوبراو بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کورد خەباتی دەکرد. سەرەڕای بەرنامەی ئەم کارانە. (بەرنامەی کاری گشتی )یشی بڵاو کردبووەوە کە بۆ لێپرسراوانی پەیڕەوی خۆی دەدوا. لەم بەرنامەی کارانەدا هێڵە گشتییەکانی ڕاپەڕین بەم شێوەیەی خوارەوە دیاری کرابوون.

١ - هەر کۆمەڵێك دەبێت سەرۆکێك و لێپرسراوێکی هەبێت.

٢ – لە هەر ناوچەیەکدا دەبێت ناوەندێکی بەڕێوەبردن بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارە مەدەنییەکان و هەروەها بۆ دابینکردنی کەرەسەی پێویستی جەنگاوەران دابمەزرێت.

٣ – تەواوی ئەو چەکە قورس و سووکانە، هەروەها تەقەمەنی و کەلوپەل و هۆکانی گوێزانەوە و ئەو خواربارەی کە لە شارەکان وناوەندەکانی حکوومەتەوە دەست دەکەوێت بگوێزرێتەوە بۆ حکوومەتی ناوەندیی کورد، فەرمانێك دەرچوو کە لە گرتنی دراوو کەلوپەلی تایبەتی خەڵکی غەیرە سەرباز خۆتان بپارێزن.

٤ – ئەفسەرانی سوپای تورك و هەروەها ئەو لێپرسراوانەی حکوومەت کە مەیلی هاوکارییان بە شۆڕشەوە هەیە دەتوانین قبوولٚ بکەین بەڵام دەبێت لە ژێر چاودێریدا بن. بنکەو هێڵی تەلەفۆن و تەلەگراف دەبێت لە ژێر نۆژەن کردنەوەدا بن بۆ ئەمەش دەبێت سوود لەو پسپۆرانە وەربگیرێت کە شایستەی پشت پێبەستنن. دەست حەقیشیان پێبدرێت. هێڵەکانی پەیوەندی و ڕێگاکانی نێوان ئاگری و دوژمن دەبێت لە ناو ببرێن. فڕۆکەو فڕگەکان دەبێت هەمیشە لە ژێر کونترۆڵدابن لیٚ نزیك بوونەوەیان قەدەغەیە).

زوهدی گویڤەن بەشێکی دەقە ئەسڵییەکەی لاداوە، بەڵام لەوانەیە لە زەحمەتییەکانی وەرگێڕانی دەقە کوردییەکە بۆ دەقێکی تورکی سەرچاوەی گرتبێت. لەبەرامبەر ئەمە ڕەفتاری دۆستانەی کوردەکانی بەرانبەر بەزیندانییە تورکەکان نەنووسیوە.

فەرماندەی کورد لە بیری ئەوەدا بوو. کە لە دوای تێپەڕبوونی تۆفانی بەلای ئەمساڵە پێش کۆتایی ئەم هێرشە چاو پێداخشاندنەوەیەك و هەموارەکردنێك کە گونجاو بێت لەگەڵٚ ڕەوشی

ئاسایشی نەتەوەپەروەرە کوردەکان بکات. بۆ ئەم کارەش کوڕی حسەین پاشاو سەید رەسووڵی بەرزنجی لەگەڵ ژمارەیەك سواردا بۆ گەلی زیلان رەوانە کردن.

بۆ سەرقاڵکردنی تورکەکان رۆژێکیان هێزێکی کورد دەوروبەری قبان تەپەیان گەمارۆدا (١٥) سەربازیك کە لە بارودۆخەکە بێئاگابوون بۆ دامەزراندنی هێڵەکانی پەیوەندی لە سنووری سەنگەرەکانی خۆیان دەرچوو بوون و لە چیاکەوە سەرەو ژێر بووبوونەوەو دەیانویست بەرەو بایەزید برۆن. تووشیان بە تووشی دەستەیەك شۆڕشگێڕی ئاراراتییەوە دەبێت لە ئەنجامی جەنگێکی کورت خایەندا هەموویان کوژران و چەکەکانیشیان کەوتنە دەست شۆڕشگێڕەکان. لەم کاتانەدا دەستە بچووکەکانی شۆڕشگێڕانی ئاراراتی لە هەموو لایەکەوە هێرشی نومایشی خۆیان دەست پێکرد. لەمانەش دەستەی عومەر گلتوری لەگەڵ بارودۆخێکی زۆر نالەباریشدا خۆیان گەیاندە هێڵی پێشەوەی بەرگریی سەربازەکان و دەرسیان دان. چەند سەربازێکیان کوشتن و چەکەکانیشیان گرتن و لەگەڵ خۆیانا هێنایان. جەنگ تادوا نیوەڕۆ درێژەی کێشا.

نابێ ئەوەشمان لە یاد بچێت ئەو رۆژەی کە هێزی تورك قبان تەپەیان داگیر کردبوو و لەسەر بەرزاییەکی بەرانبەریان ئالایەکی کورد هەڵکرابوو تەنها ئەو ئالایە بەبێ پاسەوانیش چەند مانگێك بەری بە سوپای دوژمن گرتبوو رێگەی زیادە رەویی لێگرتبوون.

لە هاویندا دامێنی ئارارات گەلێك گەرم بوو مێشوولەیەکی زۆریشی هەبوو. ئەم کەشو هەوایە لەگەڵ مەزاجی کوردەکاندا کە عادەتیان بە کوێستان و ئاو و هەوای خۆش گرتبوو رێنەدەکەوت

لەبەر ئەمە لە ناوەڕاستی هاویندا ئەو ناوچانە چۆڵکران و بنکە سەر سنوورییەکانی ئارارات بەرەو بەرزاییەکانی چیاکان هەڵکشان. دوژمن سوودی لەم گۆڕانکارییە وەرگرت و شەوێکیان هێزەکانیان لە پردی شێخلو پەڕینەوە هاتنە ناو سنووری ئارارات و بەرزاییەکانی دەوروبەری ئاوایی شێخلویان داگیرکردو چادریان لێهەڵدا، رۆژێکی دیکە ژمارەیەك لە شۆڕشگێڕەکانی ئارارات بۆ پێشوازیی دوژمن لە چیاکەوە بەرەو لای دوژمن سەرەو لێژبوونەوە، بەڵام ئەم ژمارە شۆڕشگێڕانە هێشتا نەگەیشتبوونە سنوری مەودای تەقەکردن کە هێزەکەی دوژمن چادرەکانی خۆیان پێچایەوەو بەرەو بایەزید گەڕانەوە.

ئەم گەڕانەوەیە لە ترسی هێزی ئارارات کە لە چیاکەوە سەرەو ژێر بوو بوونەوە نەبوو چونکە دوژمن لە کاتێکدا کە هاتە ناو سنووری ئاراراتەوە دەیزانی پەلاماری دەدرێت. گومان بۆ ئەوە دەچێت کە بزاقی سوارەکانی ئاراراتی لە ناوچەی گەلی زیلان تورکەکانی لەو پەلامارە نوێیە کە دەیانویست ئەنجامی دەن گێڕابێتەوە چونکە شەوی پێشوو بە ئاسانی لە بەرزاییەکاندا جێگیربووبوون و هیچ بەڵگەیەك نەبوو کە پێشبارە نوێکانی خۆیان کە تازە ناردبوویانە ئاراراتەوە بەم زوویيە بگێڕنەوە دواوە.

لە دەوروبەری گەلی زیلان تایەفەکانی قالقان و مکران لە عەشیرەتی ئەدمان نیشتەجێبوون. سەرۆکەکانی قالقان: محوی تەمەر ئاغا، محوی دەروێش ئاغا، بەکریٚ عەلی خان، تاهیری عەلی بەگ بوون و سەرۆکی بەکرانیش رەشۆری سلو بوو. لە ناو ئەمانەشدا محوی دەروێش ئاغا جێگەی باوەڕی کاربەدەستانی

حکوومەتی ئـەرجیش بـوو بەشـێوەیەك کـە ئـەو ڕۆژەی سـوارەکانی ئارارات لە ماڵی ناوبراودا میوان بوون فەرماندەی ئاسایشی ئەرجیش لە ڕووی باوەڕو دڵنیابوونییەوە ناوبراوی بۆ ئـەرجیش بـانگ کردبـوو تاکو زانیارییەك لە بارەی هاتن و نیـازی ئـەو سـوارانە پـەیدا بکـات. کارمەندانی ئەرجیش لەو گومانەدا بوون کە لە پێشـهاتی یـاخیبوونی خێڵی حەیدەری دا ناوبراو خەیانەت لە نەتەوەکـەی خـۆی دەکـات و وەفـاو ئەمـەکداریی خۆیـان بـۆ دەوڵـەتی تـورك دەردەبـڕن. لـەوە بێئاگابوون کە ناوبراو خۆی یەکێك بوو لەئەندامانی خۆیبوون.

دانیشتووانی گەلی زیلان بە خۆشی و شـادییەکی بـێ ئـەندازەوە پێشوازییان لە سوارەکانی ئاراراتی کرد کە هەڵگری فەرمان و بەیانی دەست پێکردنی جەنگ بوون لەگەڵ دەوڵەتی تورکیە. بە شـێوەیەك کە لە خۆشییانا تەماشـای مێـژووی فەرمانەکـەیان نـەکردبوو کـە لـە بەیانەکەدا ئاماژەی بۆ کرابوو، لە پێش کـاتی دیـاریکراودا پـەلاماری حەسـەن عـەبدال کـە شـوێنێکی گرنگـی دوژمـن بـوو، لـە دوو سـەد سەرباز پێکهاتبوو. لە جەنگێکی کەم خایەندا سەربازەکانیان بـەدیل گرتـن و چـەکیان کـردن. پاشـان شـارۆچکەی نوشـار کـە نـاوەندی ناحیەی گەلی زیلان بوو، دایانە بەر هێرش. یەك گوردانێکی سەربازی پیـادە کـە گوروهـانێکی شەسـتیری قورسـیش بەشـێکی بـوو، بـە هەموویان سەربازگەکەی ئەو شوێنەیان پێکهێنابوو.

فەرمانداری نوشار لـە ئەگـەری هـەر پێشـهاتێك قـەڵای نوشـاری قایم کردبوو. هەموو پێشبینییەکی پێویستی بـە ئـەنجام گـەیاندبوو. تەنها شتێك کە بە بیریا نەهاتبوو هەستی لە خۆ بووردنی کـورد بـوو کە لە ڕێگای ئازادیی نەتەوەکەیدا. لـە کـاتی هـێرش بـردن بـۆ سـەر

نوشار ئاراراتییەکان شارەکانی ئەرجیش و بارگرییان فەرامۆش نەکردبوون و هێرشێکی توندیان کردبوونە سەر.

بەڕێوەبەرانی هێرشەکان سەر گەرمی جەنگ بوون و ناردنی هەواڵی بەرەکانی جەنگیان بۆ فەرماندەیی گشتیی کورد فەرامۆش کردبوو. لە کاتێکدا فەرماندەی کورد چاوەڕوانی هاتنە پێشەوەی مێژووی هێرشەکەی دەکرد کە لە بەیانەکەدا دیاریکرابوو تاکو لە هەموو خاڵەکانی ناوچەکەدا جەنگێکی یەکگرتوو بەرپا بکرێت.

قەڵای نوشار سەرەڕای لەخۆبووردنێکی زۆر کە فەرماندەی تورك و ئەفسەرەکانی نیشانیاندا و سەرەڕای قایم بوونیشی کە لە شوێنێکی بەرزدا هەڵکەوتبوو پاراستنی ئاسانبوو، نەیتوانی تەنها (٢٤) کاتژمێر بەر بە لافاوی هێرشی دلاوەرانەی تایەفەکانی ئەدمان بگرێت و. لە دوای زیانێکی زۆر ناچار کەوتە ژێر دەستەڵاتی کورد. هێرشبەرانی کورد لە یەکەم رۆژدا بەشێکی شاری ئەرجیش و تەواوی شاری بارگرییان ئازاد کرد و دەستیان بەسەردا گرت. هێزەکانی دوژمن لە بەشەکەی تری شاری ئەرجیش و قەڵای بارگری بەر گرییان کرد.

دەستەیەك لە شۆڕشگێڕەکان کە فەرمانی بڕینی رێگای نێوان ئەرجیش- وانیان پێسپێردرابوو، بوون بە قوربانی گوێ پێنەدانی خۆیان. سەرکەوتنێکی گەورە کە لە سایەی ورەو بێباکیی خۆیانەوە بە دەستیان هێنابوو دووبارە لە دەستیان دا. لە ئەنجامدا دۆخی ناهەمواری تورکەکان لە نێو شاری ئەرجیشدا گۆڕدرا بەدۆخێکی لەبارتر. ئەم رووداوەش ئاوەهابوو:

فەرمانداریی تورک. لە ناوچەی وانەوە چەند تۆپێك و ژمارەیەك سەربازی بۆ یارمەتی دانی هێزی ئەرجیش رەوانە کردبوو. دەستەیەك شۆڕشگێڕ لە نزیك شارۆچکەی ئەرجیش بەریان بەم هێزە گرتبوو لەدوای جەنگێکی نیو کاتژمێری لەبەرئەوە تۆپچییەکان و سەربازەکان هیچ هیوایەکی رزگاربوونیان نەبوو خۆیان دابوو بەدەستەوە. شۆڕشگێڕەکانی حەیدەری لەباتی ئەوەی بەشێکیان لەسەر بەرزاییەکان بمێننەوەو تەنها چەند کەسێکیان بچن بۆ چەككردنی سەربازەکان، هەموویان پێکەوە سەنگەرەکانیان چۆڵکردو بەرەو سەربازەکان رایانکرد، فەرماندەی هێزە یارمەتییەکە چونکە کەمیی ژمارەی شۆڕشگێڕەکانی بۆ دەرکەوت لەم شکانەی خۆی شەرمەزار بوو، هەڵچوو سەر لە نوێ ورەی بە بەردا هاتەوەو فەرمانی دەستڕێژی دا. لەم تەقەکردنەدا سەرۆکی دەستەی شۆڕشگێڕەکان لەگەڵ چەند شۆڕشگێڕێك کوژران ئەوەشی کەمایەوە خۆبەدەستەوەدانیان بەلاوە نەنگ بوو و لە دۆخێکی نالەباردا دەستیان بە جەنگ کرد. لە دوای تەقاندنی ئاخرین فیشەکیان ئەم چەند کەسەشیان بوون بە قوربانیی ئازادیی گەل و بە شانازییەوە گیانیان سپارد. بەم شێوەیە هێزە یارمەتییەکە توانی خۆی بگەیەنێتە ئەرجیش و هێزەکەی دوژمنیان زیاتر بەهێز کرد.

یەکەم هێرش بۆ ناو شاری ئەرجیش تایەفەی بەکران کردیان. ئەو تایەفەش چەکی تەواویان نەبوو بە شێوەیەك ژمارەیەکیان بۆ داگیرکردنی فرگە رەوانە کرابوون لە باتی تفەنگ، لیس و بێڵیان بە دەستەوە گرتبوو بەم شێوە بێباکانە مردنیان لە رێگەی ئازادیدا لە ژیانی ژێر دەستی و نەنگیان بە لاوە باشتربوو، بێباکی و

بێپەروایییەکی لە ئەندازە بەدەری وەها کە تایبەتمەندییەکی نەژادی کوردە پەلاماری فڕگەکەیان دا، بە پێشکەشکردنی چەند قوربانییەك چوونە نێو فڕگەی شارو ئەو سەربازانەی کە پاسەوانی فڕگەکە بوون بە دیل گیران و چەککران و بەم شێوەیە خۆیان چەکدار کرد. دوو فڕۆکە کە ئامادەی فڕین بوون لەلایەن شۆڕشگێڕەکانەوە دەستیان بەسەردا گیراو بەهۆی نەبوونی فڕۆکەوانەوە هیچ سوودێکیان بۆ کورد نەبوو، هەردوو فڕۆکەکەیان تێك و پێك دان.

ژمارەیەك لە شۆڕشگێڕەکان بەرەو پاتنوس ڕۆیشتن شارۆچکەی ناوبراویان دایە بەر هێرش. سەربازگەی پاتنوس شەستیرەکانیان لەسەر منارەکانی مزگەوتەکان دامەزراندبوو و هەموو شوێنە بەرزاییەکانیشیان گرتبوو، لەگەڵ ئەمەشدا ژمارەیەك لە شۆڕشگێڕەکان توانییان بچنە نێو شارۆچکەکەوە، بەلام نەیانتوانی هیچ زیانێك بەسەربازگەکە بگەیەنن.

لە کاتی هێرش بردن بۆ سەر پاتنوس ڕێگەی قرا کۆسە – ئەرجیشیان بڕی بوو. ئەو ئەفسەرانەی لە ژێر سایەی سوارەکانی سپکیدا دەهاتن بۆ پاتنوس دوایان کەوتن و هەموویان چەککران.

سەیفەدین بەگ کوڕی فەتحوللا بەگ سەرۆکی لەوەو پێشی هەسنی لەگەڵ چەند سوارێکی جەنگاوەری هەسنی چووە نێو دەشتایی مەلەزگر و داوێنی جەنگەکەی بۆ ئەوێ ڕاکێشا. گەلی زیلانییان لە ئەنجامی هێرشی پێشوەختییان بە تەنها مابوونەوە. فەرماندەیی تورك لە هەموو لایەکەوە هێزی ڕەوانە کرد، بە شێوەیەك کە لە هەمان کاتدا کە کوردەکان لە ناو شارەکاندا سەرگەرمی جەنگ و پێکدادانی توندبوون، هێزی سەربازیی تورك بە

یارمەتیی کاریگەرانەی خێڵی کەسکۆیی لە پشتەوە چوونە نێو گەلی زیلان و حەسەن عەبدالّیان سەر لە نوێ داگیرکردەوە. هێزەکانی تورك بەهۆی کەمتەرخەمیی شۆڕشگێڕەکانەوە. ئەم شوێنانەیان داگیر کردنەوە چونکە هەروەکو وتمان گەلی زیلانیان لە پێش ئەو کاتەی کە فەرماندەی کورد دیاریکردبوو، دەستیان بە هێرش کردبوو و لە میانەی هێرشەکەشیانا هیچ هەواڵێکیان بەسەرکردایەتی رانەگەیاندبوو. لە کاتێکدا ئەگەر چاوەڕوانی مێژووی دیاریکراویان بکردایە چونکە پشتی گەلی زیلان بە دەستەیەکی تایبەتیی دیکە سپێردرابوو هێزەکانی تورك نەیاندەتوانی لە پشتی گەلی زیلانەوە بێنە ژوورەوە. سەرەڕای ئەم گوێپێنەدانەش هۆیەکی دیکەش هاتە پێشەوە، کە بوو بە هۆی ئەوە هێزی کورد بڵاو ببێتەوەو چوون بە دوای ژن و منداڵەکانیاندا کە لە کوێستانەکاندا بوون. لە نزیکی دەوارەکانی خۆیاندا بەریان بە دوژمن گرتبوو، بەرەو دوا ڕاویان دەنان تاکو هەلێك بۆ گوێزانەوەی ژن و منداڵەکانیان بڕەخسێنن و بەم شێوەیە بەرەو ئارارات پاشەکشێیان کرد. سەید عەبدولوەهابیش هاتە ریزی شۆڕشگێڕەکانەوەو لەگەڵ خێزانی ئەرجیشیان بە جێهێشتبوو.

لە جەنگی ئەرجیشدا بێجگە لەو دوو فڕۆکەیە کە لە فڕگەکەدا تێك شکێنران، چەند فڕۆکەیەکی دیکەش بە گوللەی شۆڕشگێڕەکان کەوتبوونە خوارەوە. یەکێکیان لە سەر تەپۆڵکەیەك کە چەند کاتژمێرێك لەوەو پێشتر کەوتبووە ژێر دەستەڵاتی کوردەکانەوە دەفڕی وای دەزانی هێشتا سەربازی تورك لە وێدا ماونەتەوە. بۆ راپۆرت پێدانیان نزم بووبووەوەو لەو کاتەدا کەوتبووە بەر

دەستڕێژی شەستیری کوردەکان و کەوتەخوارەوە. ڕاپۆرتە نووسراوەکەی فڕۆکەوانەکە کەوتبووە دەست شۆڕشگێڕەکان، جموجووڵی هێزە ناردراوەکانی تورکی بۆ ناوچەکە ڕوونکردبووەوە.

لەو پێکدادانانەدا. کە لە نێوان ڕێگاکاندا کوردەکان پێشانیان دەدا، لە ڕووی ماڵ و منداڵەوە زیانێکی زۆریان لێکەوت. لە کوڕەکانی ئەمین پاشا، عوسمان و ئەبوبەکر لە ناو کوژراوەکاندا بوون. کۆکوژی بێبەزەییانەی ژن و منداڵی بێدیفاعی ناوچەی گەلی زیلان لەلایەن سەربازانی تورکەوە ماوەیەك درێژەی کێشا کارەساتی دیکەی بە مێژووی کارەساتەکانی مەغۆلەوە نا. لە کاتێکدا کە فەرماندەی کورد لە بزاڤەکانی خێڵی حەیدەران ئاگادار بوو کار لە کار ترازابوو. ئیتر لێرەدا دەبوایە هەرچی زووترە باری گرانی گەلی زیلان سووکتر بکرێت. لەبەر ئەمە بەپەلە داود کوڕی دلێری برو حسکی لەگەڵ ژمارەیەك لە هێزەکانی کورد نێردرا کە بنکە سەربازییەکانی نورەشین و سوبحان لەناوبەرێت. مەڵبەندی سەرکردایەتیی سەربازیی ناوچەکە لە ئاوایی سوبحان بوو. لە دێی نورەشین تەنها چوار سەربازی لێبوو و پەلاماردانی دێی سوبحان بۆ دانیشتووانی ناو دێکە مەترسیدار بوو. چونکە سەربازەکان لە ناو دێکەدا سەنگەریان لێدابوو. بەم پێیە تێك شکانیان لە ناو ئاواییەکەدا بە زیانی کەم نەدەگونجا. نەخشەیەکیان دانا، کە لە بەرە بەیان دا پەلاماری بنکەی ئاوایی نورەشین بدەن و ڕێگەی سوبحانیش بگیرێت، هەر کاتێك کە سەربازەکانی دێی سوبحان بە نیازی کۆمەك کردنی سەربازەکانی نورەشین لە دێ هاتنە دەرەوە ئیتر مۆڵەتی گەڕانەوەیان نەدرێت.

ئەو هێزەی کە ئەم ئەرکەی پێسپێردرابوو، بەسەرکەوتوویی ئەنجامی دا. لە دوای چەند جەنگێکی توند سەربازەکانی هەردوو بنکەکە بە دیل گیران و چەککران. ژمارەی دیلەکان لە سەد سەرباز زیاتربوو. دیلەکانیان لەگەڵ خۆیانا هێنا و بۆ دابینکردنی شوێنی دانیشتنیان و خۆراکیان بەسەر ماڵە ئاراراتییەکاندا دابەشکران.

ئەمڕۆکە پارچە بۆمبایەکی فڕۆکەکان بەر ئەژنۆی دایکی برو حسکی کەوت. ئەم پیرەژنە زیاد لە سەدو دە ساڵ تەمەنی هەبوو. ئەم دایکە کوڕانی دلاوەری وەك برو حسکی ئەیوبی پەروەردە کردبوو، قارەمانێکی دیکەشی بە ناوی ئەحمەد لە ڕێگەی ئازادیی کوردا کرابوو بە قوربانی، لەم بارەدا بریندار بوونی نموونەیەکی دیکەی ئازایەتی و بێباکیی نیشان دەدا. پارچە بۆمباکە ئێسکی ئەژنۆی ورد کردبوو، بەڵام ئەم ژنە بە ساڵدا چووە گەورەیی خۆی لە دەست نەدا، بە هێواش و لەسەرخۆییەکی ئاساییەوە ئەوانەی دەچوونە سەردانی بەخێر هاتنی لێدە کردن سەبارەت بە بەسەرهاتی برینەکەی دەدوا، بۆی روون دەکردنەوە کە چۆن ئەژنۆی وردبووە، ماسوولکەکانی ئاوسابوون و لەناوچووبوون، بووبوو بە چەند پارچەیەکەوە و هیوای ژیانی لێبڕیبوو. گەلێك بە ئاساییەوە گۆشتە لەتبووەکانی بە دەست لە ئێسکەکەی جیا دەکردەوە چۆنیەتیی برینەکەو وردبوونی ئێسکەکەی نیشان دەدان. ئەیوت: (من پیربووم ئەم برینەی منیش چارەی نییە سوپاسی یەزدان دەکەم کە ئەمڕۆکە منی کرد بە قوربانی ڕێگەی ئازادی و بەلایەکی بە کوڕانی ئارارات نەگەیاند و جەنگاوەرەکانی پاراست).

ڕۆژی دوای ئەوە نۆرەی هێرش بۆسەر بنکەکانی بڕون سوور و بڕون ڕەش بوو. ئاراراتییەکان گەلێکیان حەز دەکرد کە ئەو تۆپە گەورەیەی لە بڕون سوور دانرابوو و بووبوو بە هۆی ناڕەحەتیی هاتووچۆکەران بەدەست بێنن. حەزیان دەکرد لوولەی ئەم تۆپە گەورەیە. بەرەو بنکەی سەرکردایەتیی سەربازانی تورك وەرگێڕن.

شەو تەرتیباتی پێویست جێبەجێ کرا. لە نزیکی بەرەبەیاندا هێرش بۆ هەردوو شوێنەکە کرا. هێشتا تاریك بوو، لەلای بنکەی بڕون ڕەشەوە تەقە دامەزرا. فەرماندەی بڕون سوور بە تەلەفۆن خەبەری بە بنکەی بایەزید دەداو دەیوت لەبنکەی بڕون ڕەش جەنگ دەستی پێکردووە، بەڵام لە ناوچەی ئێمەدا ئاسایش بەردەوامە. ئەم فەرماندە لاوە لەوە بێئاگابوو کە شۆڕشگێڕەکان دەورەیان داوە، ئەوەندە لێوە نزیك بوونەتەوە. کە تەنانەت گفتوگۆ تەلەفۆنییەکەیان دەبیست.

هەوا ڕووناکبوو. دەنگی تەقەی ئەم بنکەیەش بەرز بووەوە. تورکەکان لە تەپۆڵکەکەدا بە چاکی سەنگەر بەندییان کردبوو، لەسەر تەپۆڵکەکە ڕێگای هاتوچۆکردنیا بە باشی دروست کردبوو. لە یەکەم هێرشدا کوردەکان خۆیان گەیاندە سەر تۆپەکە. تۆپچییەکانیان لە تۆپەکە دوور خستنەوە. سەربازەکان لە سەنگەرەکانیاندا خۆیان ڕاگرت و دەستیان بە بەرگرییەکی توندکرد. ماوەی نێوانی هەر دوو لا بیست تا بیست و پێنج مەتردەبوو. کوردەکان بەشێکی بەرزاییەکە کە تۆپەکە و چادری سەرکردایەتییەکەیانی لێبوو گرت، ئاگری کوردەکان بەسەر ئاگری دوژمندا بەشێوەیەك زاڵبوو، کە لەم نزیکییەوە دوژمن بە پێوە

تەقـەیان دەکـرد. سـەربازەکان نـەیاندەتوانی سـەر بـەرز بکەنــەوە. تەنها شەستیرێك نەبێت کە فــەرماندەی سـەربازە تورکـەکان لـە نـاو سەنگەرێکی مەحکەمەوە خودی خۆی بە کاری دەهێنا کاریگەر بوو. درێژە کێشانی ئەم جەنگە بە زیانی کورد تەواو دەبوو. چونکە لـەوە دەچوو هێزی یارمەتی بۆ تورکەکان بێت. هەرچـەندە کـە لـە شـەودا هــەموو شــتێك تــەرتیب کرابــوو. دەســـتەکەی فتــو باڵەخانـــەی وێستگەیەك کـە لـە ناوەڕاسـتی ناوچـەی بـرون ســوورو وێســتگەی بایـەزیدا هەڵکـەوتبوو داگـیرکردو ڕێگـەی هـاتنی هـێزی دوژمنــی لـــە باشوورەوە گرتبوو. گرتنی ڕێگایـەك کـە لافـاوی هێرشـبەرانی تـورك هەرچەندە بەهێز بێت، نەیدەتوانی پیاتێپەڕێ.

سوارەکانی تورك لە پشتی تاشبرون کۆبووبوونــەوە نـەیاندەوێرا پێشڕەوی بکــەن. ڕاگـەیاندنی مەترسیداری گوللـەی شەسـتیرەکانی فتویان بـەبێ ئەهمیــەت نــەدەزانی، تەنــها لــە دوورەوە خــەریکی سەیرکردنی لەناو بردنی سەربازەکانی خۆیان بوون. لەگەڵ ئەوەشدا تەنها هەڵەیەکی بچووکی شۆڕشگێڕەکان بە نرخی خوێنی هــەموویان تــەواو دەبــوو، ڕێگــەی گەڕانــەوە تــەخت و دەشــتایی و گـــەلێك مەترسیدار بـوو. بـە پێچەوانـەوە ســەنگەری ســەربازەکان بەســـەر بەرزاییەکەوە بە تــەواوی بەسـەر شـانۆی جەنگەکـەدا زاڵبـوو، لەبـەر ئەمە پێویستبوو کارەکە تەواو ببێت.

لەم گەرمەی جەنگەدا دوو سـواری کـورد لـە پـردە بەردینەکـەی شـیخلووەوە ڕاسـتەوخۆ بەرانبـەری کـۆڕی جەنگەکــە دایانــە غــار. هەرچـەندە گوللـەی تفـەنگ و شەسـتیرەکانی دوژمـن لــە پێشــوازی کردنی ئەم دوو سوارەدا کورتییان نەدەکرد، بەڵام ئەگەر بــە ڕاسـتی

بیانزانیایە کە یەکێکیان خودی فەرماندەی گشتی کوردو ئەوی دیکەشیان برو حسکییە بە بەهای گیانی هەمووشیان ئەگەر تەواو بوایە نەیاندەهێشت ئەم دووانە گیانیان دەرباز بکەن. تۆزێك دوای گەیشتنی ئەو دوو سوارە، بە بەرزاییەکە جەنگ کۆتایی هات.

(کاتێك کە فەرماندەی کورد توانی بگاتە لووتکەی بەرزاییەکە. هاواری کرد: من ئیحسان نوریم. هاتووم پێتان بڵێم دەست لە ئازاردان و شوێنکەوتنی کوردەکان هەڵگرن، تاکو ئێستا تەنها یەکێك لە شۆڕشگێڕەکان نە کوژراوە بەپەلە خۆتان بە دەستەوە بدەن، ئەگینا پەشیمان دەبنەوە. سەربازەکانی تورك چەکیان دانا بەپەلە خۆیان دا بەدەستەوە. ئەمەش کۆتایی نەبەردەکە بوو).

زیانی سەربازەکان گەلێکبوو. فەرماندەکەشیان لە ناو کوژراوەکاندا بوو. ئەوەی کە مابووەوە بە دیل گیران. بە رێکەوت ئاخرین گوللەی تورکەکان. بەر سینگی پڕ لە شانازی عەدو عەمکی حسە سووری کە دڵێکی پاك و پڕ لە سۆزو بێغەشی هەبوو، کەوت و گیانی شیرینی لە دەست چوو.

بە پەلە لوولەی تۆپەکە ئاراستەی سەربازگەی تورك لە وێستگەی بایەزید کرا، لەلایەنی خودی تۆپچییەکانی تورکەوە دەست بە تۆپبارانی سەربازگەکە کرا. ئەم تۆپچییە دیلانە جگە لە ملکەچی و گوێڕایەڵی هیچ چارەیەکی دیکەیان نەبوو، بەڵام بەداخەوە ئەم تۆپە تەنها بیست و حەوت گوللەی لەگەڵدا بوو.

لەم جەنگەدا نوێنەری نوێی ئەرمەنییە کۆچەرەکانی واهان کە لە هێزی سوپای قەیسەری رووسدا پلەی ئەفسەری هەبوو، بۆ تەماشاکردنی هێرشی بێباکانەی ئاراراتییەکان هاتبوو بۆ لای

فەرماندەی کوردی هاوڕێی و لە بەرزاییەکی بڵندی شێخلووەوە بە دووربینەکەی تەماشای ڕووداوی سەرەوەی دەکرد.

فەرماندەی ئەو دەستەیە کەی پەلاماری بڕون ڕەشیان دەدا. فەرزندە بەگ بوو. ناوبراو لە یەکەم هێرشدا بریندار بوو. یارمەتی دەرەکەشی نورو کوڕی دلێری مووسا بەرکی کوژرا. سەربازەکان لە ناو چوار دیوارێکدا کە دروستیان کردبوو، جێگیر بووبوون و بەرگرییان دەکرد. لە دوای گرتنی بڕون سوور بڕو حسکی لەگەڵ ژمارەیەکی کەمدا بەرەو چیای قوتیس سەرکەوت و لەسەرەوە بەرەو خوار بۆ یارمەتیدانی هێرشبەرانی شۆڕشگێڕان لە بڕون ڕەش کەوتە ڕێ.

هێرش بەرانی کورد بە برینداربوونی فەرزندە بەگ و کوشتنی نورو بێ سەرکردە مابوونەوە. هاتنی بڕو حسکییان بە یارمەتیدەری هێزی دوژمن زانی، گەمارۆکەیان بەجێهیشت و بەرەو ئارارات پاشەکشێیان کرد، ئەم دەستەیە کارێکی گرنگتریان لە چەککردنی سەربازەکانی بڕون ڕەشیان لە ئەستۆدابوو، بەلاّم بەداخەوە لە سەرەتاوە لە ئەنجام دانی فەرمانی فەرماندەیی بێدەربایس بوون.

بڕیار بوو ئەم دەستە ژمارەی چل سوارێکیان بەشەو لووتکەی چیای قوتیس بگرن، شارو قەلاّی بایەزید و لووتکەی شەیتان بخەنە ژێر ئاگری چەکەکانیانەوە. لە دوای تەواوبوونی کاری بڕون ڕەش فەرزندە بەگ بە هێزەکەی خۆیەوە چوو بۆ لووتکەی ناو بڕاو و لە سەرەوە بەرەو خوار تاکو بۆ گەردەنەی شەیتان و شاری بایەزید هێرش بەرێت. ئەم چل سوارە تا نیوەی ڕێ ڕۆیشتبوون، یانی بەرزاییەکەی سەرووی نورەشینیان گرتبوو، بەلاّم بەرەو لووتکە

سەرنەکەوتبوون. تەنها کارێك کە ئەنجامیان دابوو ئەوەبوو، کە سوارەکانی تورکیان لە گورجی بلاغ –لەسەر سنووری ئێران– کە بۆ یارمەتیی برون رەش دەهاتن گەڕاندبوونەوە دواوە.

فەرزندە بەگ بەهۆی ئەو ورە بەرزی و ئازایەتییەوە کە هەیبوو بە تفەنگەکەی دەستی پەلاماری دیوارێکی بەردینی سەختیدا و بریندار بوو. برو حسکی لەوە دڵنیابوو کە لووتکەی چیاکە بە دەستی شۆڕشگێڕانەوەیە لە بەرانبەر چیای قوتیسەوە سەرکەوتبوو. لەدوای پاشەکشێی کوردەکان ناوبراو لە نێوان دوو ئاگری دوژمندا خۆی رزگار کردو گەڕایەوە بۆ ئارارات. ئەم دۆخە نالەبارە بوو بە هۆی ئەوە کە شۆڕشگێڕەکانی برون سوور، لە دوای گرتنی تۆپەکەو بە دیل گرتنی سەربازەکان درێژە بە هێرشی خۆیان نەدەن و ئەوانیش گەڕانەوە بۆ ئارارات. ئەم دەستەیە ئەوەشی پێسپێردرابوو کە لە دوای گرتنی تۆپەکە، بەرەو برون رەش هێرشبەرن و دەستی بەسەرا بگرن و تۆپەکەش بەرنە پێشەوە بە یارمەتیی کاریگەرانەی تۆپەکە، وێستگەی بایەزیدیش بگرن و لە خوارەوە بەرەو سەرەوە پەلاماری شار بدەن و لەگەڵ هێزەکەی فەرزندەدا پێکەوە یارمەتیی یەکتر بدەن.

تۆپەکە قورس بوو، هیچ هۆیەك بۆ هەڵگرتن و گوێزانەوەی نەبوو. ناچار بەهۆی دیلەکانەوە بە ماندوو بوونێکی زۆر رایان کێشا بۆ ئارارات. ئیتر بردنی بۆ لووتکەی چیاکان و سوود لێ وەرگرتنی نەدەگونجا. لەبەر ئەمە چەخماخی تۆپەکەیان دەرهێناو لە شوێنێکی پەنهاندا شاردیانەوە، تاکو ئیتر کەس نەتوانێت سوودی لێ وەربگرێت.

هەمان شەو تورکەکان پۆستەکانی برون ڕەش و تەنانەت بنکەی سەرەکی گرجی بلاغ کە لە بەرانبەر بازرگان( خالّی گومرگی ئێران) هەلّکەوتبوو چۆلّیان کردو هێزەکانی خۆیان بۆ لووتکەی چیاکانی بەرانبەر ئارارات گوێزابووەوە. چەند ڕۆژێ، دوای ئەوە دەستەیەك لە هێزەکانی ئارارات سوودیان لە تاریکیی شەو وەرگرت و خۆیان گەیاندە نزیکی شارۆچکەی باشکەند، باشکەند لە خۆرهەلاّتی دەشتی ئیغدیردا هەلّکەوتبوو. ناوەندی ناحیەی ئارالیق بوو. دانیشتووانی تورك زمان بوون، لە نێوان ئارارات و سنووری شوورەویدا بوو. لە بەرەبەیاندا جەنگ دەستی پێکرد. یەك کاتژمێر دوای خۆرهەلاّتن شارۆچکەکە دەستی بەسەرا گیرا. سەربازەکانی تورك شاریان چۆلّکرد هێزە شۆڕشگێڕەکانی کورد دوایان کەوتن. جەنگ لە دەرەوەی شاردا درێژەی کێشا. کوردەکان ڕێگەی ئیغدیریان گرتبوو. فەرماندەی تورك ناچاربوو بەرەو سنووری شوورەوی پاشەکشێ بکات لە دوای زیانێکی زۆر بەشێك لە سەربازەکان بە دیل گیران کە ژمارەیان لە (١٥٠) سەرباز زیاتربوو. شۆڕشگێڕەکان نزیکەی سێ سەربازی دیکەشیان لەناو شاردا گرتبوو. پاشماوەی ئەم هێزە سەربازەی تورك خۆیان گەیاندە کەناری روباری ئاراس یانی گەیشتنە سەر سنووری شوورەوی کەوتنە ژێر سایەی یارمەتیی دەستڕێژی شەستیری سەربازە پیادەکانی رووس و لە دەست ئاراراتییەکان رزگاریانبوو. لە دواییدا هەوالّمان زانی کە دەولّەتی شوورەوی بە تەواوی رێزەوە پێشوازیی لێکردبوون، بە هەموو چەك و کەرەسەکانیانەوە. دووبارە لە

ڕووبارەکەوە پەڕاندبوونیانەوە، بەرەو شاری ئیغدیر ڕەوانەیان کردبوونەوە.

دانیشتووانی باشکەند لە سەرەتاوە ڕێزی هێزی ئاراراتیان دەگرت. لەبەردەم ئاڵای کوردستاندا کە لە جێگەی ئاڵای کۆماری تورکینە لە ئاهەنگێکی تایبەتیدا لە سەر باڵەخانەی حکوومەتی باشکەند هەڵکرا مەڕیان دەکرد بە قوربانی. مەلا حسەین شۆڕشگێڕی ئایینی و نەتەوایەتی کە لە دەورو پشتی وانەوە هاتبوو بۆ ئارارات و لەناو خێڵی گلتوراندا نیشتە جێبووبوو. لەگەڵ عومەر بەسێ و هێزێکی باشدا، ئەرکی ئەوەی پێسپێردرابوو کە لە کاتی هێرشدا بۆ سەر باشکەند، برون ڕەش داگیربکەن. (ئەم برون ڕەشە شوێنێکی دیکەیە کە لە نێوان ڕێگەی باشکەندو ئیغدیر– دایە) بەم شێوەیە ڕێگە لە هێزی کۆمەکی تورك بگرێت. ئەم ئەرکەش ئەنجام نەدرابوو. لە دواییدا تورکەکان یەك گوردانیان بۆ تاشبرون ڕەوانە کردبوو.

لە دوای چەند ڕۆژێك عومەر بەسێ بۆ قەرەبوو کردنەوەی هەڵە و گوێپێنەدانەکەی ڕابوردووی بە لە خۆبوردنێکی تایبەتی خۆیەوە پەلاماری برون ڕەشی دا سەربازەکانیان لە نێو چادرەکاندا دەرپەڕاند چوونە نێو چادرەکانیانەوە بەڵام بەدبەختانە بەر گوللەیەکی دوژمن کەوت و گیانی دەرچوو، بەڵام شۆڕشگێڕەکان لەسەر جەنگەکە بەردەوام بوون و چەند بەرزاییەکیان لە تورکەکان سەندەوە. لەم کاتەدا تورکەکان یارمەتییەکی گەورەیان بە ئۆتۆمبێلی باری لە ئیغدیرەوە بۆ هات، لە ئەنجامدا کوردەکان نەیانتوانی ئەو شوێنانەی کە دەستیان بەسەرا گیرابوو بپارێزن.

(هاتنی هێزی یارمەتیدەری تورك نەیهێشت كە كوردەكان پارێزگاری سەنگەرەكانی خۆشیان بكەن، توركەكان بە شەستیر و نارنجۆكەوە هاتنە نێو كۆڕی جەنگەكەوە زوهدی گویڤەن نووسیویەتی: ئەم جەنگە هەشت كاتژمێر درێژەی كێشا).

چەند رۆژێك دوای ئەوە رووداوێك لە ئێراندا روویدا كە بوو بەهۆی داخ و كەسەری ئاراراتییەكان. بەپەلە لەناوچوونی ئاراراتییەكانی مسۆگەركرد.

(لە دوای تێك شكانی گەلی زیلان، ژمارەیەك لە ژن و منداڵانی كورد لە ناو خێڵی جەلالی كە سەر بە ئێران بوون دەژیان و خەریكی لەوەڕاندن و پەروەردەكردنی مەڕ و ماڵاتبوون ئەم خێڵە جەلالییە لەم كاتەدا لە كوێستانەكانی ناوچەكەی خۆیانابوون كە لە ناوچەی ئوەجقی سەرسنووری ئێران و توركدا بوو)[1].

هێزەكانی تورك ئەمەیان كرد بە بیانوو بەهێزێكی زۆرەوە پەلاماری سنووری ئێرانیان دا. بە شێوەیەك كە فڕۆكەكانیان بۆمبارانی خاكی ئێرانیان كرد، لە چالدەران[2]. لە بەرانبەر ئەم

---

[1] بابەتی ناو كەوانەكەلە ژمارەی دواییدا لە رۆژنامەكەدا بەم شێوەیە راستی كردووەتەوە:(لەدوای شكستی گەلی زیلان ژمارەیەك لە ژن و منداڵانی كورد چوونە ناو خێڵی جەلالی لە خاكی ئێران. ئەم خێڵە لەوكاتەدا لە كوێستانە كانی خۆیانا لەناوچەی ئوەجەق لەسەر سنووری ئێران و توركیەدابوون).

[2] لە بنچینەدا: چاردلان.

زیادەڕەوییە فەرماندەی سەرسنووری ئێران هیچ بەرگرییەکی نەکرد[٣].

خالید ئاغای سەرۆکی خێڵی جەلالی کە دەوارەکانی خێڵەکەی کەوتبوونە بەر هێرشی تورکەکان بۆ ئەوەی ژن و منداڵی خێڵەکەی و مەڕ و ماڵاتەکانیان بەردەستی تورك نەکەوێت و سەرەڕای ئەمەش کاتی گەڕاندنەوەی خێڵ لە کوێستانەکانەوە بۆ جێگەی زستانیان هاتبوو. لە دوای جەنگێکی کورت لە ژێر دەستڕێژی بارانی گوللەی تورکەکاندا باری کرد و گەڕایەوە بۆ دەشتی ئوەجق.

(فەرماندەی هێزەکانی سەر سنوورەکانی ئێران بۆ بەرگری کردن لە زیادەڕەوی بۆناو قەڵەمڕەوی ئێران هیچ جۆرە هەنگاوێکی نەنا. هەروەها کاربەدەستانی ماکۆ فەرمانی بە خێڵی جەلالی دا کە بگەڕێنەوە بۆ شوێنی خۆیان کە کەوتبووە ژێر کۆنترۆڵی سوپای تورك. ئەوانیش بە هیچ شێوەیەك نەیاندەتوانی ئەم فەرمانە بە جێ بهێنن. چونکە ئەم کارە ئەوە دەگەیەنێت کە خۆیان بە دەستی تورکەکانەوە بدەن).

فەرماندەیی ماکۆ فەرمانی بەخێڵی ناوبراو دا بسەماڵ و منداڵەکانیانەوە و هەروەها بە مەڕو ماڵاتیانەوە بۆ شوێنی یەکەمیان واتە هەمان ئەو شوێنەی کەوتبووە بەرهێرشی تورکەکان و بەشێکیشی کەوتبووە ژێردەستی ئەوان، بگەڕێنەوە. ئەم فەرمانە بۆ خێڵەکە شایانی ڕاپەڕاندن نەبوو. چونکە ساردیی هەوا لە لایەکەوە بردنی ماڵ و منداڵ و مەڕو ماڵات و کەلوپەل بۆ ناو ئاگر لەلایەکی

---

[٣] ئەم دەستەواژەیەی سەرەوە بە(هەنگاو نەناوە) ڕاست کردووەتەوە.

دیکەوە بە هیچ شێوەیەك ئـەم کارەیـان بـە بـاش نـەدەزانی. خـالید ئاغا لە بەرانبەر ئەم فەرمانەدا وەڵامی فەرماندەی ســەربازی مـاکۆی دایەوە: هێزی تورك زیادەڕەوی بۆ ناو سنووری ئێران دەکەن. ئێمــە بـۆ بــەرگری کــردن لــە خــاکی ئــێران ئامـــادەی هـــەر چەشــنە لـەخۆبووردنێکین. یـەك ئەفسـەری پلـەدارو چـەند سـەربازێکمان بـۆ رەوانـە بکـە ئێمـەش بـە هـەموو چـەکدارەکانی خۆمانـەوە لــە ژێــر فـەرمانی ئـەو ئەفسـەرەدا کـە رەوانـەی دەکـەن گوێڕایـەڵ دەبـین و دەچـین سـنوورەکەمان دەگرینـەوەو تورکــەکان لــە خــاکی ئــێران دەردەکـەین، بـەڵام بردنـی ژن و منـداڵ و مـەڕو مـاڵات بـێ سـوودە. مۆڵەت بدەن کە دەوارەکانمـان لـێرەدا بمێنێتـەوە، بـەڵام فـەرماندی سەربازی ماکۆ لە سەر وتەکەی خۆی سوور بوو.

یاوەر فەتحوڵاخان لەگەڵ ژمارەیـەك سـواردا کـە هـەندێکییان لـە دانیشـتووانی تـورك زمـانی ناوچـەی مـاکۆ بـوون هاتنـە نـاو خێڵــی جەلالیەوە، محەمەد ئەمین ئاغای برای خالید ئاغا کـە سـەرۆکی ئـەو بەشەی خێڵی جەلالی بوو، چوو، بەرەو پیرییــەوە، یـاوەر فـەرمانیدا کە دەبێت هەر ئێستا خێڵ بار کات و بگەڕێتــەوە بـۆ کوێسـتانەکانی خۆیان لەسەر سـنوور. محەمـەد ئـەمین دەڵێـت کـە سـەربازی تـورك شوێنی هەوارەکانی ئێمەی داگیر کردووە بۆ ژن و منداڵ ناگونجێت، خۆم و هەموو پیاوە چەکدارەکانم لە ژێر فــەرمانین بـۆ هـەر کوێیـەك فەرمان دەفەرمووی ئێمە حــازرین و دەڕۆیـن. یـاوەر فـەتحوڵلا خـان دەڵێت:حەتمەن دەبێت بە ژن و منـداڵ و مەڕوماڵاتـەوە برۆنـەوە بـۆ کوێستان. محەمەد ئەمین لە وەرامدا وتی:ناتوانین ژن و منداڵ بەرەو نیشانگەی گوللەی دوژمن بەرین و لە ناویان بـەین. لـەم مشـتومڕەدا

دەبن یاوەر فەتحوللاخان دەمانچە حەوت تیرەکەی دەردێنێ محەمەد ئەمین ئاغا لە ناو دەوارەکەی خۆیا دەکوژێت و خۆشی بە غاردان دەگەڕێتەوە.

پیاوەکانی محەمەد ئەمین ئاغا هەموویان چەکدار بوون،لە بەر ڕێزگرتنی دەوڵەتی ئێران تە نها گوللەیەك بەرەو یاوەر ناتەقێنن، بەڵام ئەو سوارە چەکدارانە کە لەگەڵیا بوون هەموویان گرتن و چەکیان کردن. خالید ئاغا ئاگاداری ڕووداوەکە بوو. لە نزیك تەرمی براکەیەوە نامەیەکی بۆ فەرماندەی سەربازیی ماکۆ نووسی. لە نامەکەدا نووسیبووی: براکەی من کە کوژراوە بە قوربانی ئەعلاحەزرەت هومایون بێت، بەڵام چونکە خێڵ بەرەو گەرمیانی خۆی دەڕوات داوا دەکەم ڕێگەمان پێ نەگری.

شەو خێڵ بار دەکات و ڕێگەی گەرمێنی خۆی دەگرێتەبەر. (خێڵەکان لە گەڕانەوەیان بۆ شوێنی زستانەیان بە زۆری بە شەوا بار دەکەن. بە ڕۆژدا پشوو دەدەن و مەڕو مالآت دەلەوەڕێنن). نزیکی نیوە شەو دەگەنە دەربەندی گاجووت. بنکەی سەربازی بەهێز کراوی دەربەندی گاجووت لەناو دەربەندەکەدا کە لەسەر بەرزاییەك دامەزرا بوو خێڵەکە دەداتە بەر دستڕێژ و گوللە بارانیان دەکات. چەکدارەکانی خێڵەکەش پەلاماری بنکە سەربازییەکە دەدەن، ئەفسەرە کەش و سەربازەکانیش بە دیل دەگرن و چەکیان دە کەن بەو شێوەیە ڕێگا دەکەنەوەو لە سنووری ماکۆ دەچنە دەرەوەو لە دەوروبەری ئاوایی تانەلی دەوار هەڵدەدەن. یاوەر فەتحوللا خان، بەم شێوەیە نەخشەی شوومی خۆی پیادە کردو بە شێواندنی

مێشكی فەرماندەی لەشكر و سەرلەشكر خزمەتێكی گەورەی بە توركەكان كرد.

ڕۆژی دوایی ئەم هەواڵە خەم ئامێزە گەیشتە ئارارات. بۆ كۆتایی هێنان بەم ڕووداوە خەمناكانە فەرماندەی كورد لەگەڵ چەند كەسێكدا لە گەورە پیاوانی ئارارات هات بۆ ناو خێڵی جەلالی، ئەفسەر و سەربازەگیراوەكانی ئازاد كرد و چەكەكانی حكوومەتیشی بۆیان گەڕاندنەوە و بۆ چارەسەركردنی ڕووداوەكەو كۆتایی هێنان بەم پێشهاتە بەفەرماندەی لەشكری ئەوێ یانی سەر لەشكر حسەین خانی موقەدەمی ئاگادار كرد كە سەبارەت بەم ڕووداوە هەرچی خواست و فەرمانی حكوومەتە و هەرچییەك كەنیازتان وایە لەم ڕووەوە بیكەن پێمان رابگەیەنن، تاكو فەرمانەكانی حكوومەت لەلایەنی سەركردایەتیی كوردەوە جێبەجێ بكرێت. بەهۆی ئەم ڕووداوەوە مووسا ئیبراهیم ناو سەرۆكی خێڵی ساكانی ئێران كە بە خێڵەكەی خۆیەوە دراوسێی بنكە سەربازییەكەی ئێران بوو، لە ئای بەی دەواری هەڵدابوو بۆ خۆ خۆشەویستكردن. ڕاپۆرتێكی بۆ فەرماندەی لەشكری ئازربایجان نووسیبوو ئەمەی تیا دەربڕیبوو:(سوارەكانی ئاراراتی ئامادەن پەلاماری بنكە سەربازییەكانی ئێران بدەن). هەرچەندە فەرماندەی لەشكری ئازربایجان لە ئەنجامی ئەزموونی چەند ساڵەی لە بیرو نیازی ئاراراتییەكان بەتەواوی ئاگادار بوو و هیچ گرنگییەكی بەم وڕێنانە نەدەدا، بەڵام لەوە دەچوو مووسا ئیبراهیم لەلایەن سوڵتان

مەحموود خانـەوە[1] سـەرۆکی بنکـەی ئـای بـەی هـاندرابێت کـە ئـەم نامەیە بنووسێت، سـوڵتانی نـاوبراو هـەم بـۆ تـەواوکردنی نەخشـەی یـاوەر فـەتحوللاخان، فـەرمانی لــە ژووروی هــەمان یــاوەرەوە وەرگرتبێت.

خالید ئاغـا لـە سـەرۆکایەتیی خێڵـی جـەلالی لابـرا و کـوڕە گەورەکەی کەناوی عومەر ئاغا بوو لە جێگەی باوکی بوو بەسەرۆکی خێڵەکە دانا، ناوبراو ئامۆزاکەشی حەسەن خالیدو کوڕێکی دیکەشی مستەفا بـۆ دەربڕینـی دۆسـتایەتی بـۆ لای ئـەمیر لەشـکر نـارد فەرماندەی لەشکر مستەفای بـرد بـۆ تـەورێزو لـەوێدا بـە نیشـاندانی خۆشەویستییەکی بێپایانەوە گەڕاندیانەوە بۆ ماکۆ، بـەهیوای سـۆزو بـەزەیی حکوومـەت گەڕایـەوە. خـالید ئاغـا لـە شـاری مـاکۆ چـەند دۆستێکی ڕێزداری هەبوو. هەمان ڕۆژ یـەکێکیان هـەواڵ بـە مسـتەفا بەگی کوڕی خالید بـەگ دەگەیـەنێت کـە ئـەم شـەو هـێزی سـەربازو چەکداری جاش دەوروبەری دەوارەکەی بابت دەگرن خـالید ئاغـا یـا بەزیندوویی یان بە مردوویی دەگرن.

مستەفا بەپەلە ماکۆ بەجێ دەهێڵێت، دەگاتـەوە مـاڵی بـاوکی و لە هەواڵی هاتنی هێزی سەرباز ئاگاداری دەکات. خالید ئاغـا لەگـەڵ دەوارەکانی دەوروپشتی خۆی شوێنەگۆڕکێ دەکات و دەگوێزێتەوە، چونکە بڕوایەکی تەواوی بە هەواڵدەرەکە هـەبوو. کـوڕە مامەکەشـی حسۆی ئەیوب کە دەوارەکەی لە پشـتی دەوارەکـانی خـالید ئاغـاوە بوو، دراوسێی ئاسینجین بوون باوەڕی بەم هەواڵـە نـەکرد، شـەو لـە

[1] لە وەرگێڕانی فرەنسیدا یوسف خان هاتووە.

شوێنی خۆی نەجوولا هەواڵی هەواڵدەرەکە راست بوو لە شەوا ژمارەیەك لە هێزی حکوومەت کەپێکهاتبوو لە سەربازو جاش، کەوتبوونە ڕێ، کە گەیشتنە شوێنی دەوارەکانی خالید ئاغا و شوێنەکە یان بە چۆڵکراوی بینی، چوونە پێشەوە دەوروبەری یەکەم ئەو دەوارانە کە پەیوەندییان بە بەشی حسۆی ئەیووبەوە هەبوو گەمارۆ دا. بەیانی زوو حسۆی ئەیووب لە کاتێکدا کە دەیویست مەڕو ماڵات لێخوڕێ بۆ لەوەڕ لە نێوان دەوارەکاندا درانە بەر دەستڕێژ گوللەیەکی بەرکەوت و گیانی لە دەست دا. لەم دەستڕێژەدا کەبۆ ناو دەوارەکان کرا، برا ژنی خالید ئاغاش کوژرا. لایەنگرانی حسۆی ئەیووب دەستیان بە بەرگری کرد. بەهۆی دە نگی تەقەکانەوە ژ مارەیەك سواری کورد کۆ بوونەوەو دەستیان بە جەنگ کرد، هێزەکەی حکوومەتیان شکان. لەدوای تێکشکانەکەش لە لایەنی سوارەکانی کوردەوە دوایان کەوتن و لە ئەنجامدا ژمارەیەك بەتایبەتی لە جاشەکان کوژران و بەجێمان.

سەرۆکەکانی ئارارات دووبارە ناوبژییان کردەوەو بەریان بە خێڵی خەلکان گرت. فەرمان بەرداری و گوێڕایەڵی و دڵسۆزیی ئەم خێڵەیان بۆ حکوومەتی ئێران دابینکرد، بەڵام دەبێت بڵێین کە خێڵەکە بە هیچ جۆرێك لە حکوومەت دڵنیا نەبوو، ئەم رووداوە بە هیچ شێوەیەك تاوانەکەی لە ئەستۆی کوردا نەبوو.، نازانرێت بە چ شێوەیەك گوزارشیان بەکاربەدەستانی دەوڵەت دابوو، کە هەموو کوردەکان لە پێشچاوی دەوڵەتی شاهەنشاهی ئێراندا بە یاخی لە قەڵەم درابوو، یارمەتیی ئەعلا حەزرەتی کۆچکروی بۆ هێزی تورکیە سەبارەت بە لەناوبردنی کوردی ئارارات راکێشاو کەوتە کار.

(هەر بەو شێوەیەی کـە روونمـانکردەوە بـە ئیحتیمـالێکی بـەهێز گوزارشـەکە مووسـا ئیـبرا هیـم بـە درۆکـانی یـاوەر فـەتحوللا، رازاندبوویەوەو رەوانەی کردبوو. یـاوەر فـەتحوللاخان ئازربایجـانی و تورك زمانبوو، خزمـی سـەرداری مـاکۆ بـوو. لەگـەڵ ئەمەشـدا ئەمـە پێچەوانەی مەنتیق بوو کـە حکوومـەتی ئـێران پایـەی کارەکـانی لـە سـەر بناغـەی گوزارشـێکی بـەو چەشـنە دابڕێژێـت، بـەم گورجییـە کاردانەوەی ڕاست و دروسـتی شۆڕشـگێڕانی ئـاگری لـە مـاوەی ئـەم چـوار ساڵەی دواییـەدا فـەراموٚش بکـات، کـە هەمیشـە ڕێزیـان لـە بەرژەوەندییـەکانی حکوومـەتی ئـێران گرتـووە. حکوومـەتی ئـێران دەبوایـە نـاوەرۆکی ئـەو گوزارشـانەی بـە وردی لێـك بدایەتـەوە و شـیبکردایەتەوە. چـەند ماوەیـەك لـە پێـش روودانـی ئـەم رووداوەدا فەرماندەی کورد. دەرکـەوتنی ئـەم جـۆرە مەسـەلانەی لـە ئـایندەدا پێشـبینی کردبـوو و لـەم رووەوە پێشـنیاری بـە حکوومـەتی ئـێران دابـوو. حکوومـەتی ئـێران دەیتوانـی لـە کـاتی هاتنـە پێشـەوەی لێکنەگەیشـتنەکەدا بـەرگری لـە پەیوەندییـەکانی نێـوان خۆیـان و ئارارات بکات..)[1]

کۆچـەرەکانی گـەلی زیلانیـش چـوون بـۆ ئـارارات بـەم شـێوەیە ژمارەیەکی زۆر رژابوونە ئاراراتەوە لە بارەی بژێوییـەوە کێشـەیەکی زۆر دروست ببوون. ئارارات لە هەموو لایەکەوە لە ژێر ئابلووقەیـەکی گەلێك بـە هـێزدابوو. فڕۆکـەکانی تورکیـەش پەیاپـەی گوللـە بـارانی

[1] ئیحسان نوری، لە بارەی ئەم پیشنیارانەوە هیچ روونکردنەوەیەکی نەداوە(و).

دەوارەی ئاراراتییەکانی دەکرد. ئەم فڕۆکانە کە هەمیشە لە ئاسمانی ئاراراتدا لە فڕیندا بوون. هەندێ جار بەر گوللەی شۆڕشگێڕەکان دەکەوتن و نەدەگەڕانەوە بۆ فرگەکانیان. یەکێك لەم فڕۆکانە لە ترسانا گەلێك بەرز هەڵفڕیبوو. لەمەودای چەکی ئاراراتییەکان چوو بووە دەرەوە خۆی گەیاندبووە بەرزترین لوتکەی ئاگری ئەمەش بۆ ئاگری شایستەی قبووڵکردن نەبوو، چونکە لە گەورەیی ئەم چیایەی کەم دەکردەوە. چونکە تا ئەو کاتە چیای ئاگری سەر لووتکەکەی خۆی لە مرۆڤ شاردبووەوە لەم ڕۆژەدا ئیتر ئاگری نەیدەتوانی مۆڵەتی دوژمنانی ڕۆڵەکانی بدات ئەوەندە لەخۆباییبن و بەرزە فڕبن. دەبێت ئەم دوژمنە لەخۆبایی بووە تەمێ بکرێت. گەردەلوولێکی بە هێزی ئاگری هەڵیکردو فڕۆکەکەی وەها سەرنگوون کرد و لەناوچەی ئاراراتدا کەوتە خوارەوەو فڕۆکەوانەکەی پارچە پارچە بوو بوو. بەم شێوەیە ئەو لەخۆبایی بووە بە سزای خۆی گەیشت و نەیتوانی ئەوەی دیتبووی بۆ خەڵکی بگێڕێتەوە.

کاتی گەڕانەوەی خێڵ لە کوێستانەوە بۆ گەرمیان هاتە پێشەوە، دەوارەکانی ئاراراتییەکان بەرەو دامێنی چیا هاتنە خوارەوە، نادر بەگ کوڕێکی دلاوەر و لەخۆبووردووی حسەین پاشا بوو. ئەرکی ئامادەکردنی خواربارى پێسپێردرابوو. بە پەنجا سوارەوە لە ئاراراتەوە ڕێکەوت. لێرەدا دەبێ بڵێین کە کوڕانی حسەین پاشا بە پێچەوانەی باوکیانەوە لە ڕێگای ئازادیدا گیانبازانە خزمەتی گەلەکەی خۆیان دەکرد و لە لای هەموان خۆشەویست بوون و ڕێزێکی تەواویان هەبوو. دووبارە دەبێت ئەوەش

روونبکەینەوە کە کوشتنی حسەین پاشا لەگەڵ تەواوی ئەو کارانەشیدا کە سەبارەت بە نەتەوەکەی خۆی ئەنجامی دابوو، هەموو شۆڕشگێڕەکانی نیگەران کردبوو. بە شێوەیەك کە بکوژەکەی (سەدەنی)[1] لە گەورە پیاوانی مووش بوو لە ریزی تاوانباران و خەیانەتکاراندا دەژمێردرێت.

فەرماندەی ماکۆ ئەو بڕوا و دڵنیاییەی کە ئاراراتییەکان بەرانبەر بە دەوڵەتی ئێرانی شاهەنشاهی هەیانبوو هەمووی لە دژی ئاراراتییەکان بەکاری دەهێنا. بەم شێوەیە کە یاوەری یەکەمی ئاغالارۆف (یارمەتیدەری دووهەمی حکوومەتی ماکۆ) نارد بۆ سەر سنووری ئارارات و فەرماندەی کوردی ئاگادار کرد کە ئاراراتییەکان دەتوانن کاروانێك رێکخەن و بۆ دێهاتەکانی ماکۆی ڕەوانە بکەن و هەرچەند خواربایان پێویستە بیکڕن و بیبەنەوە بۆ ئارارات. ئەگەر بە راستی ئەم پێشنیارە راستبووایە کۆمەکێکی گەورە بوو بۆ ئاراراتییەکان و لەو رۆژگارە رەشەدا بۆ شۆڕشگێڕەکانی کورد نرخێکی گەلێك گەورەی هەبوو، بەڵام بەداخەوە ئەمەش فێڵ و تەڵەکەیەك بوو بۆ ئیفلیج کردنی جموجووڵ و کەمکردنەوەی هێزی پارێزگاری ئاراراتییەکان.

ئاراراتییەکان وەکو لە پێشەوە ئاماژەمان بۆ کرد خۆیان بە نەژادی بێگەردی ئێرانی دادەنا و چاوەڕوانی هیچ هەنگاوێکی دوژمنانەیان لە لایەنی دەوڵەتی ئێرانەوە نەدەکرد، لەبەر ئەمە بەم یارمەتییەی فەرماندەی ماکۆ دڵشاد بوون. بە سوپاس و دڵنیاییەکی

---

[1] لە بەشەکانی پێشەوەدا ناوبراو بە {مدنی}ناو براوە

بێپایانەوە کاروانێکی گەورەیان رێکخست و رەوانەی ئێران کران، بەڵام جارێکی دی ئەو کاروانەیان نەبینییەوە. چونکە لە دووهەم رۆژی رۆیشتنی کاروانەکەدا هێزێکی گەورەی تورك. ئاخرین و گەورەترین هێرشی خۆی بۆ سەر ئارارات دەست پێکرد و بەشێك لە خاکی ئێرانیش کە لە پشتی ئاراراتییەکانەوە بوو، بۆ سەرکوتکردنی کوردەکان خرابووە ژێر دەستەڵاتی سوپای تورکیە.

دەرکەوت فەرماندەی ماکۆ لەباتی ئەوەی ئاراراتییەکان ئاگادار بکات کە ئەو بەشەی خاکی ئێران خراوەتە ژێر دەستەڵاتی سوپای تورك، ئەوانی لەخشتەبردبوو و هۆیەکانی گوێزانەوەو ژمارەیەك چەکداری لە ئاراراتەوە بردە دەرەوە بۆ ئێرانی راکێشان. سەرەڕای ئەمەش وێڕای دوورخستنەوەی خێڵە ئێرانییەکان لە سنووری ئارارات و بەشێك لە خێڵی قزڵباش ئۆغلی کە چەند ساڵێك لەوە و پێشتر هاتبوونە تورکیە لەم جەنگەی ئازادییەدا. پاراستنی بەرەی باکووری خۆرهەڵاتی ئارارات – سەردار بۆلاغی– پێسپێردرابوو، لە لایەنی فەرماندەی ئێرانەوە دڵنیا کرابوون و بۆ ئێرانیان بردبوونەوە.

حکوومەتی تورکیە بە بانگەشەیەکی زۆر و زەبەندی تێکەڵ بە هەڕەشە دەیویست شۆڕشگێڕەکانی ئارارات ناچار بکات و ملکەچبوون. بەتایبەتی لەناو شۆڕشگێڕەکانی خێڵی حەیدەراندا چالاکییان دەنواند. نامەیەکیشیان بۆ برو حسکی و شێخ عەبدولقادر نووسی ئەوانیان دڵنیادەکرد و داوایان دەکرد کە شۆڕشگێڕەکانی حەیدەران و جەلالی بگەڕێنەوە دێهاتەکانی خۆیان و ملکەچی دەوڵەت بن. لەخۆبردووەکانی کورد بە پێچەوانەوە برسیەتی و پەرێشانی و تەنانەت کوشتنیش لە ژێر ئالای نەتەوەیی خۆیانا لە

گەڕاندنەوە بۆ ملکەچبوونی تورکیایان بەلاوە پەسەندتربوو. تەنها لە ناو ئەوانەدا عەبدوڵا حەسەن ئاغا لەگەڵ کوڕەکەیدا کە ناوی بایەزید بوو گەڕانەوە بۆ تورکیە، بەڵام خۆبەختکەرانی حەیدەری ڕێگەیان پێگرتن ویستیان بیانکوژن، بەڵام ناوبژیوانی سەرکردەکانی ئارارات بووە هۆی ڕزگار بوونیان. لەدواییدا بیسترا کە لە دوای ڕووخانی ئارارات تورکەکان ئەوەندەیان لەو پیرەمێردە بێچارەیە دابوو لە ژێر قەمچیدا گیانی لە دەست دابوو.

پەلاماری ئارارات درا، لەشکرەکانی تورك دەهاتنە پێشەوە. ئاراراتییەکان لە پشتەوەو لە سنووری ئێرانەوە دڵنیابوون. چونکە ئەو ناوچەیان بە بێلایەن دادەنا. بۆیە ژن و منداڵ و مەڕ و ماڵاتی خۆیان بۆ سەر سنووری ئێران ڕەوانەکرد. جەنگاوەرەکانیش بەریان بە هێرشی تورك گرت. نیازیان وابوو وەکو ساڵەکانی لەوەو پێش هێواش هێواش سوپای تورك بۆ ناوەڕاستی ئارارات رابکێشن، ماندووی بکەن و دای ڕزێنن. لە نێوان بەردە ترسێنەرەکان و دۆڵەکاندا پەرت و بڵاویان بکەنەوەو لە ناویان بەرن.

پۆلێك لە فڕۆکەکانی تورك لە ئاسمانی ئاراراتدا دەفڕین و تەقەمەنییەکانی خۆیان بەزۆری بەسەر ژن و منداڵی بێتاوانا دەباراند. ئەم پۆلە ئەرکی خۆیان بە جێدەهێنا پۆلێکی دیکە دەردەکەوت ودەستیان بە بۆمباباران دەکرد.

برو حسکی لەگەڵ چەند جەنگاوەرێکی حسە سووریدا لای ڕاستی بەرەی خۆر ئاوایان گرتبوو، وەك مێخ چەقیبوون. هێرشی توندی یەك لە دوای یەکی پیادەی سەربازی تورك نەیدەتوانی تەکانێك بەم بەربەستە بدات. تەنها مەرگ دەیتوانی دەنگی فیشەکی

بڕو حسکی لەو ناوچەیەدا خامۆش بکات. یەکەم ڕۆژی جەنگ کۆتایی هات. هەردوو لایەنی جەنگەکە بە حیسابی خۆیان لە جەنگەکە ڕازی بوون. ڕۆژی دووهەم ئاراراتییەکان بەلەخۆبووردنێکی لە ئەندازە بەدەرەوە بە بەردە یادگارییەکانی باب و باپیرانی خۆیانەوە نووسان،کەوتبوونە ناو جەنگێکی خوێنینەوە. لەم کاتەدا لە پشتی لای سەرەوە لەسەر سنووری ئێرانەوە بە پێچەوانەی چاوەڕوانیی جاران دەنگی تۆپ لە ئای بەی خاڵی پشتی سەر سنووری ئێرانەوە لە دواییشدا دەنگی دەستڕێژی شەستیری پیادە بەرز بووەوە. دۆخی ئاراراتییەکان گەلێك ناساز بوو کە لەگەڵ سوپای ئێراندا هەرچۆنێك بێت بکەونە جەنگەوە.

فەرماندەی کورد ئەم ڕووداوەی بەوە لێکدایەوە کە سەرچاوەکەی لە یەك نەگەیشتنە، بە هیوای چاککردنی، فەرمانی بەرەنگارنەبوونەوەی لەگەڵ سوپای ئێرانی دەرکرد. خۆشی چوو بەرەو سنوور، بەڵام کاتێك گەیشتنە سەر سنوور شتێکی باوەڕپێنەکراوی دیت: هەنگەکانی سوپای تورك لە خاکی ئێرانەوە و هەم لە پشتی ئاراراتەوە هێرشی خۆیان دەست پێکردبوو. دەرکەوت کە دەوڵەتی ئەوکاتەی ئێران داواکارییەکانی دەوڵەتی کۆماری تورکیەی پەسەند کردووەو بەشێکی لە خاکی خۆی کە لە پشتی ئاراراتەوە بوو، بۆ لە ناوبردنی ئەم ناوەندەی نەتەوەی کوردە – ناوەندی نەژادی ئێرانی– خستووەتە ژێر دەستەڵاتی فەرماندە باڵادەستەکانی تورك.

نووسەر لێرەدا حەق یا ناحەق بوونی گلەییەکانی ئاراراتییەکان کە خۆیان بە کۆنترین نەژادی ئێرانی دەزانن و لە ماوەی جەنگ و

پێکادانی چەند ساڵەیان، لەگەڵ دەوڵەتی تورکیە، لە بەرانبەر دەوڵەتی شاهەنشاهی ئێراندا جگە لە دۆستایەتیی راستی و رێزگرتن دەستییان بۆ هیچ کارێکی دیکە درێژ نەکردبوو. دادوەریکردنیان بە رۆشنبیران و نیشتمان پەروەرانی ئێرانی دەسپێرم.

پەرە هەڵدرایەوەو بارودۆخی کوردەکان بەدتر بوو بوو. ئەم بەرە فراوانە بە کۆمەڵێك جەنگاوەر لە توانادا نەبوو بەرگریی لێبکرێت، ناچار خۆیان بەرەو لووتکەکانی ئارارات هەڵکێشا، رۆژی دووهەمیش بەسەر چوو. لە رۆژی سێهەمدا بوو. ئاراراتییەکان هەر بستێکی خاکی خۆیان بە خوێنی خۆیان سوور و ئاو دێر نەکردایە بە جێیان نەدەهێشت. تەنانەت دەستیان بەهێرشی نوێی بەرانبەر کردبوو. بەرگری لە ئەندازە بەدەرو هێرشی بێباکانەی کوردەکان ژەنەراڵ ساڵح پاشای فەرماندەی هێزی ناردراوی تورکی ناچارکرد داوای هێزی کۆمەکی بکات تاکو بتوانێت شوێنی کوژراوەکانی پڕبکاتەوە. لەو هێزە کۆمەکییە لەرۆژی دواییدا چەند سەربازێکیان بەر دەستی ئاراراتییەکان کەوتن، زانرا کە هێزەکەیان لە دەوروبەری باش قەلاوە هاتوون و شەو و رۆژ بە رێوەبوون، تا خۆیان گەیاندبووە ئارارات، بەلام کوردەکان لە هیچ شوێنێکەوە بەهیوای کۆمەك بۆ هاتن نەبوون. لەم رۆژەدا هەنگە سەر بازییەکانی تورك لە خاکی ئێرانەوە دەوروبەری ئاراراتیان گرتبوو، بەبێ بەرگری سەردار بولاغیان داگیرکرد.

{کوردەکان ئیتر چاوەڕوانی هیچ کۆمەکێکیان نەدەکرد. لەشکری سەربازیی ژەنەراڵ ساڵح پاشا لە ناوچەی واندا خستبووی، حکوومەتی تورك بۆ دەست پێکردنی پەلامارەکەی، کەمالەدینی

سامی پاشا سەفیری خۆی لە بەرلینەوە بانگ کردبووەوە ناوبراو لـە ساڵی (١٩٢٠) دا فەرماندەیی سوپای نوێی قەفقازی لە ئەستۆدا بوو. زیـاد لەمـە لـە ئەسـتەموولیش بـە نوێنـەری مسـتەفا کـەمال پاشـا دەژمێردرا، لە کاتێکدا کە ئیحسان نوری بۆ لابردنی دەوڵـەتی فـەرید پاشا راپەڕی سامی پاشا بانگی کردە ماڵی خۆی هەموو زانیارییەکی سـەبارەت بـە نیازەکـانی خـۆی پـێ ڕاگـەیاند بـوو، لـە دوای رمـانی دەوڵـەتی فـەرید پاشـا، ئیحسـان نـوری خـۆی لـە بەشـداریکردنی راپەڕینە شۆڕشگێرییەکانی تورك کێشایەوەو کەمالەدین سامی پاشـا کـرا بەسـەرۆکی ئـەرکانی سـوپا. وا دێتـە پێشـچاو نـاوبراو بـەهۆی پەیوەندییەکـەوە کـە بـە ئیحسـان نورییـەوە هـەیبوو کرابـوو بـە فەرماندەی جەنگ و ئەم پلەیەی پێدرابـوو، سـەرەڕای پـەنجا هـەزار سەرباز کە لـە دژی ئـاگری لـە جـەنگدابوون بیسـت هـەزار سـەربازی دیکەش ئەرکی دژایەتیی ئەو خێڵە کوردانەیان پێسـپێردرابوو کـە لـە دەرەوەی ئـاگریدا پـەرش و بـڵاو بووبوونـەوە، دەسـتیان بـە جـەنگ کرد. هەر لەم ڕۆژانەدا بوو کە هەنگەکانی تـورك لـە خـاکی ئێرانـەوە هاتنە نێو جەنگەکەوەو پەلاماری هەردوو لای ئاگرییان دا}.

نوێنـەری ئەرمەنییـە کۆچڕەوەکـان کەرووداوەکـەیان بینـی لـەو کاتەدا دواکەوتن بۆ ماوەی (٢٤) کاتژمێری بۆچۆڵکردن، بە زەرەرو و زیانی ئاراراتییەکان دەزانی، هیچ هیوایەکی رزگار بوونیان نـەدەدی. بۆیـە بـە پەلـە داوای چۆڵکردنـی ئاراراتیـان کـرد، بـەڵام کوردەکـان چونکە تامی خۆشی ئازادییان چەشتبوو، هیچ کـاتێك حـازر نـەبوون ئەو ئازادییە بەم هەرزانییە لە دەست بدەن و ئارارات بدەنـە دەسـت دوژمن، لەبەر ئەمە فەرماندەی کورد لە وەڵامدا وتی:

(ئێمە کوردین لە گەماڕۆدان باکمان نییە. هێڵی گەماڕۆ هەرچەندە تەنگترو بە هێزتر بێت ئەگەر نیازی چوونە دەرەوەمان هەبێت دەتوانین درزی تێبکەین. شتێك هەیە ئێمە لە بەر خاتری ژیانی تاکە کەسی نامانەوێ واز لە ئازادیی گەل بهێنین. راستە لەم دۆخەدا. هیچ کلاورۆژنەیەکی ئومێد نییە بەلام مانەوەی ئیوەش لە ئاراراتدا هیچ سوودێکی نییە. هێشتا بازنەی گەمارۆدانەکە بە تەواوی بەدەوری ئاراراتدا نە کێشراوە ئەمە بە هەل بزانن ئەو شارەزایانە کە هەتانە لەگەڵ خۆتانا بەرن و ئەمشەو بڕۆنەدەر) ئەم شارەزایانە چوار پێنج کەسی ئەرمەنی بوون کە لە رۆژی دووهەمی جەنگەکەدا هاتبوون بۆ ئارارات، بەلام ناوبراو سوور بوو لە سەر ئەوە کە بەلانی کەمەوە خودی فەرماندەی کورد ئەو شەوە لە ئارارات بچێتە دەرەوە، بەلام وەلامی فەرماندەی کورد لەم ڕووەشەوە ئەمەبوو:

(ئەم وتەیە لای من بێبایەخە. من لە هاوڕێ لە خۆبردووەکانم ئازیزتر نیم. ئەگەر قەدەرمان کوژران بێت با هەموومان پێکەوە بکوژرێن).

فەرماندەی کورد لەنێو جەنگەکەدا مایەوە، نوێنەری ئەرمەنییەکان لەگەڵ چەند کەسێك لە پیاوەکانی بۆ ئامادەکردنی هۆیەکانی رۆیشتن چوون بۆ پشتی بەرەکانی جەنگەوە لە هەمان شەودا لە ئارارات چوونە دەرەوە. لەکاتی رۆیشتنەکەیانا داوای کردبوو کەمال و منداڵی فەرماندەی کوردیش لەگەڵ خۆیانا بباتە دەرەوە لە مەترسی رزگاریان بکات و وتبووشی کە ئیحسان نوریش لە دواییدا دێت، بەلام خانمی فەرماندەی کورد وتبووی هەر

مەترسییەك روو بكاتە هاو سەرەكەم با رووبكاتە منیش هەرگیز لە ناو ئاگردا بە جێی ناهێڵم و خۆم رزگاركەم. باپێكەوە بكوژرێین.

رۆژی دوایی راپۆرتێك بەدەستی فەرماندەی كورد گەیشت، ئەوەی رادەگەیاند: كە چەند هەزار سەربازی سوپای رووسیا بە هاوڕێیەتی لەگەڵ لەشكری هێرشبەری توركیە لە روباری ئاراس پەڕینەوە و دامێنی لای باكووری ئاراراتیان گرتووە، ئاراراتییەكان هەرچەندە لە بەرانبەر ئەو هێزە زەبەلاحەدا و بە یارمەتیدانی حكوومەتەكانی شوورەوی و ئێران بە حكوومەتی توركیە بۆ لەناوبردنی رێكخراوەكانی ئاگری زانیبوویان كە سەر لەنوێ بەرگریكردن هیچ ئەنجامێكی نابێت، بەتایبەتی كە ژن و منداڵەكان لە هەموو لایەكەوە لە ژێر لێزمەی بارانی گوولەی زەمینی و ئاسمانی دوژمندا بوون و ئازادی جموجوڵیان لێبڕابوو، هێشتا رێگەیان نەدەدا كە ختووره بە دڵیانا تێپەڕێت.

سەرۆكەكانی ئاگری كۆبوونەوەیەكیان پێكهێنا، لە دوای لێكدانەوەیەكی ورد سەبارەت بە بارودۆخی ئارارات بە رێكەوتنی گشتی بڕیاریاندا تا دوا هەناسەیان درێژە بە جەنگ بدەن و بڕیاریاندا لە دوای تەواوبوون و تەقاندنی ئاخرین فیشەكیان بە خەنجەرو مستەكۆڵەوە هێرش بەرنە ناو ریزەكانی دوژمن، سەرەڕۆكان كە نیازی پارچە پارچە كردنی پەیكەری ئازادی كوردیان هەبوو بە ددان وردو خاشیان بكەن، با هەموومان پێكەوە بكوژرێین. ئەم رێگەی ئازادی نەتەوەییە كە هەرگیز ناتوانن تاسەر بپێون بەو بیرەوەریانە كە لە كوشتنی خۆمانەوە بە رۆحییەتێكی دلێرانە و ئازایەتیەكی بێوێنەوە بەجێدەهێڵین ببیتە سەر مەشقێك بۆ نەوەكانمان. چەند

جوانبوو کەسانێك کە لە شکۆداری خۆبەخت کردنی کوردی تورکیەدا
بۆ بەدەست هێنانی ئازادی گەل هیچ دوو دڵیەکیان نەبوو. ئەم
دیمەنە بێباکانەی لەخۆبردوانەی مللی گەرایانەیان بە چاوی خۆیان
دەبینی.

گۆیا چیاکان ودۆڵەکانی ئاگری لەگەڵ کوڕکانی خۆی پێکەوە
ئەیانوت:

نــــیزەیی تورکـــــان درانــــدن زگـــان
ژ خـــوونا کـــوردان سووربـــوون ئـــەوالان
دەنگــــیٚ تفەنگـــان چیایـــان هـەلـــــدان
مێرخاســـێن وەتـــەن هـــاوار بگـــەهن

مانای شیعرەکان:

نێزەی تورکەکـــــان زگیـــان هـــەڵـــدڕی
لەخـــــوێنی کـــوردا دۆستەکان سووربوون
دەنگی تفەنگەکـــان لە چیاکانا دەنگیان دایەوە
دلێرانی نیشتمان فـــــریـــاکـــــــەون

هێرشی دلێرانەی کورد دەستی پێکردبوو، بەڵام سوودی چییە !
وەکو تیرێك لە دەریایەکی بگیرێت شەپۆلە خرۆشاوەکانی کونبکات و
بڕوات ئیتر نەگەڕێتەوە دواوە لە ئەنجامدا بۆ خۆشی دەبێتە خۆراکی
ئاوی دەریا. لە راستیدا رێــژەی ژمـارەی هـەردوو لا بـەم جـۆرە بـوو
(یانی وەکو تیرێك لە ناو دەریایەکدا بێت ( و).

ژیـان گرنگیـی نـەمابوو. کـوژران و کوشـتن شـێوەی کـارێکی زۆر
ئاسایی بەخۆوە گرتبوو.

لەبەرەی باکووردا لە ئاستی قور خان هێرشێکی سەختیان برد بۆ چیای کوپکول کە سەربازە تورکەکان گرتبوویان. دووبارە چیاکەیان گرتەوە و سەربازەکانیان بەرەو قباق تەپە ڕاو نان، بەڵام لە بەرانبەر سەربازی بێژماری دوژمن ئەنجامێك کە ئەویسترا بە دەست نەهات.

ئەو ناوچانەی کە ئاراراتییەکانی تیا جێگیر بووبوون سووتەمەنیی تێدا نەبوو، ئاویش زۆر کەم بوو. ئەمەش بووە سەرباری دەردی برسییەتی و دەردەکانی دیکەش. چەند ڕۆژێك جەنگ بەم شێوەیە درێژەی کێشا. فڕۆکەکانی تورك هیچ جیاوازییەکیان لە نێوان کوردی ئارارات و ئێراندا نەدەکرد، دەوارەکانی مووسا ئیبراهیم کەلە ئای بەی بوو لە کەناری پۆستی سەرسنووری دەوڵەتی شاهەنشاهی ئێراندا بوو، خستبوویانە ژێر ئاگری بۆمبا کانیانەوەو چەند کەسێکی لێکوشتبوون.

دیمەنی دڵتەزێنی ژن و منداڵەکان کە لە ژێر گوللە تۆپ و بۆمبادا بەملا و ئەو لادا رایان دەکرد، دڵە پۆڵایینەکانی پیاوانی دەهێنایە جۆش. ژنان دەپاڕانەوە کە نەبنە هۆی ئەوە کە خۆیان و منداڵەکانیان دەستی دوژمن کەون. داوای رزگار بوون یا کوشتنیان بە دەستی پیاوەکانی خۆیان دەکرد.

هێڵی گەمارۆ ئەوەندە تەنگ بووبووەوە کە دوژمن لەهەر لایەکەوە بیویستایە دەیتوانی ئاگری چەکەکانی لە خاڵێکدا کۆ بکاتەوە، ئیتر وەکو مەیدانی کەربەلای لێهاتبوو، لەگەڵ ئەو جیاوازییەدا کە هێرشبەرەکانی عەرەب هەقیان بە سەر ژن و منداڵەوە نەبوو، بەڵام هێرشبەرانی سەربازی تورك، سکی ئافرەتی

کوردیان بە نێزە هەڵدەدڕی منداڵیان بە نووکی نێزە لە سکی ئافرەتان دەردەهێناو فڕێیان دەدان.

شوکری خێزانی دێوانە ناوێك، برازایەکی برو حسکی و ژنەکانی دیکەش کە دەستی تورك کەوتبوون هەر بەم چارە نووسە گرفتار بووبوون. محۆی تەمەر ئاغا لە سەرۆکەکان، پیاوێکی پیرو نەخۆش و توانای جموجووڵی نەبوو، لە دوای شکانی ئەرجیش بە زەحمەت خۆی گەیاندبووە ئارارات، لەگەڵ نەبو کە مامی برو حسکی بوو ئەویش زیاد لە (١٢٠) ساڵ تەمەنی بوو، لەگەڵ عەلیکۆ ناوێکی هەسنی کە بەهۆی نەشتەرگەریی سەریەوە نەخۆش و بێهۆش و لە جێدا کەتبوو لەگەڵ ژمارەیەکی دیکەی پیرو نەخۆشدا کە لە گۆشەو کەناردا مابوونەوەو بەردەستی دوژمن کەوتبوون لە کاتی گرتنیانا، گیانی بێتوانایان بوو بە نیشانگەی تاقیکردنەوەی تیژیی نووکی نێزەی سەربازەکانی تورك.

خێزانی عەلیکو ژنێکی جوان و ساغ بوو، لە ئەنجامی وەفاداری بەرانبەر بە مێردەکەی لەگەڵ کچێکی بچووکیا بەلای تەرمی مێردەکەیەوە مایەوە، کچەکەی دیکەشیان کە سوارەکانی فەرزندە لەگەڵ خۆیانا بردبوویان و رزگاریان کردبوو،لە دەستی سوارەکان هەڵهات و خۆی گەیاندەوە لای تەرمی باوکی، باوك و دایك و هەردووکچە پێکەوە بوون بە نیشانەی نێزەی سەربازەکانی تورك، لە کاتی هەڵفڕینی رۆحەکانیان بەرەو ئاسمان یەکتریان بەجێنەدەهێشت لە یەك جیا نەدەبوونەوە، ئەمەکداریی ئەندامانی خێزانی کوردیان نومایش دەدا، تەنانەت تاماوەیەك لە دوای رووخانی ئارارات (٢٧) کەس لە ژن و منداڵەکانی ئەحمەد حاجی برو

حەیدەری و براکانی کە لە جەنگاوەرە بەرجەستەکانی ئارارات بـوون لـە نزیکـی سـنووری ئـێران لـە ناوچـەی سـەرکانی بەردەسـتی سـەربازەکانی تـورك کـەوتن و هـەموویان، یـانی ئـەو (٢٧) کەسـە بێتاوانـەیان گوللـەباران کـرد. لاشـەکانیان تاماوەیـەك لـەو شـوێنەدا کەکوژرابوون مابوونەوە. ئەحمەد حاجی برۆ کە براکەی ناوی سوفی پوشۆ بوو لە ئاخرین جەنگی ئاراراتدا لە دەستی دابـوو، لەگـەڵ دوو بـرای دیکەشـیا ئەسـلان و عـەبدوڵا وەختێـك گەیشـتنە کوشـتارگای نـاوبراوان لاشـەی ئـافرەت و منداڵانـی بێتاوانیـان لـە نێـو خوێنـا بەگەوزاوی بینی.

ئەمانە ئاخرین قوربانیانێك نەبوون کـە بنەماڵـەی حـاجی بـرو لـە رێگای ئازادیی گەل و نیشتمانەکەیاندا پێشکەشیان کردبوون، بـەڵکو ئـەم شـانازییەیان بـۆ خـودی ئەحمـەد و براکەشـی ئەسـلان بـە جیهێشتبوو، چونکە ئەوانە دووبارە ماوەیەك لە دوای ئەم ڕووداوە لە جەنگێکدا خۆیان گەیاندە کاروانی شەهیدانی رێگای ئازادی.

بـیری نـامووس پەرسـتی و غـیرەت پـەروەریی ئاراراتییـەکان، پاشماوەکانیان ناچار کردبوو، چاوێك بە بڕیاری سـەرەتایی خۆیـاندا بخشـێننەوەو ژن و منداڵـەکانیان لـە دەسـت دوژمـن رزگـار بکـەن. دەستەیەکی تێکەڵاو لە خێڵەکانی حـەیدەری و گلتـوری هێرشـێکیان بۆ سـەرهێزی دوژمـن بـرد، کـە لـە ئاسـتی باشـکەند و ئـاخورێکی ژووروووەوە هاتبوون بەرەو پاش و لای خوارەوە راویان نـابوون. لـەم هێرشـە دلێرانەیـەدا خـاڵی لاوازی هێڵـی گەمارۆکـە ئاشـکرابوو، لـە خۆرئاوادا مەڕو ماڵات بەجێهێڵدرا لەگەڵ ژن و منەکانا لە دوو خاڵەوە دەستیان بـە چوونـە دەرەوەکـرد، دەسـتەی یەکـەم،بەهێرشـێکی

شەبەیخوونی گەمارۆکەیان شکاند لە رۆژی دواییدا چەند کاتژمێرێك لە رۆژ رۆیشتبوو چوونە دەرەوە. دەستەی دووهەم بۆ لە خشتەبردنی دوژمن بەرەو قۆرخان رۆیشتن رۆژیان لەوێ بەسەر برد و لە شەوی دووهەمدا رزگاریان بوو. ژمارەیەکیشیان لە قۆرخانەوە بۆ ناو تورکیە بڵاوەیان کردبوو،لەناو ئەم کۆمەڵەیەدا رەشو سلوی سەرۆکی جەنگاوەرانی تایەفەی بکران. لەگەڵ ژمارەیەك لە چەکدارەکانی خۆیانا ماوەیەك لە ناوچەی گەلی زیلان نیشتەجێ بووبوون چەند جارێك هێزی تورکیان شکاند، بەڵام لە دواییدا لە جەنگێکدا کوژرا. بەم شێوەیە ئارارات ئەو ناوەندەی کوردە کەوتە دەست تورکەکان و سیاسەتی کۆکوژی کورد لە هەموولا یەکەوە دەستی پێکرد.

* * *

{سەید ئیسماعیل[1] بەرزنجی ماوەیەك لەگەڵ گرووپەکەی خۆی لە بەرانبەر گەمارۆی دوژمندا لە دەورو پشتی بایەزید بەرگریی کرد، بەڵام بە هۆی گرانییەوە لاوازبوو، هەموویان بەبێ ئەوەی خۆیان بە دەستی تورکەکانەوە بدەن کوژران}.

فەرماندەی تورکیە لە کاتی جەنگەکانی ئاراراتا پەیامی زارەکی و نووسراویشی بۆ خالید ئاغای سەرۆکی خێڵی جەلالی–ی ئێرانی ناردبوو کە لە لایەن فەرماندەی ماکۆوە زیانی لێکەوتبوو و تەماعی نابووە بەرو، بە خۆی و خێڵەکەیەوە بانگی کردبوون بۆ تورکیە. ناو

---

[1] –لە دەقە فەرەنسەییەکەدا ( رەسووڵ) نوسراوە

براو لــه دوای نــهمانی ئـارارات لـه ترسـی دەوڵـەتی ئـێران بـه خێڵـی خلیکانەوە چوو بۆ تورکیە.

زوهدی گویڤەن، لەم بارەوە ئـاوای نووسـیوە: سـەرەتای مـانگی ئاب هەواڵم پێگەیشت. کە خالید ئاغای سەرۆکی تایەفــەی خلیکـانلو لەگـەڵ دەوڵـەتی ئـێراندا لێکیـان داوە، لـە نێـوان تایەفەکـەی ئـەو و هێزەکانی ئێراندا چەند لێکدانێکی پەراگەندە روویداوە. لە کاتی ئەم جەنگانەدا خالید ئاغا زیـانێکی زۆری لێکـەوتبوو، لـە دواییـدا بـەرەو چیاکـانی ئـای بـای رۆیشــتووە (لــەر تایەفــەی خلیکـانلو لــە دژی حکوومەتی ئێران جەنگیان نەکردبوو، بەڵکو بە هەمان شێوە کـە لـە پێشەوە ئامارەمان بۆ کرد. تەنها چەند پێکاهەڵپژانێکی پرش و بـڵاو لـە نێوانیـاندا روویدابـوو سـەرەڕای ئەمـەش بـەرەو چیـای ئـای بـای نەرۆیشتبوو).

لەم کاتــەدا ئەفســەرێکی شــوورەوی پــەیامێکی بـۆ ئەفســەرێکی تورکی سەرسنوور رەوانە کردبوو، نووسیبووی: (چـوار سـەد خـێزان لە تایەفەی خیلکانلو،لەم دواییەدا هاتوون بۆ ناوچەی دیل– ئـاراليق کە لە ناو قەڵەمڕەوی تورکیەدایە. ئەم تایەفەیە هەشت سـەد پیـاوی چەکداریان هەیە و رۆژانــە دانیشـتووانی شـوورەوی لێیـان دەترسـن. ئەگەر ئێوە ناتانـەوێت پـەلاماریان بـدەن مۆڵـەتی ئێمـە بـدەن تـاکو ئەوانە ناچار بکەین بگەڕێنەوە).

{لەوە دەچێت هەر بەم بیانووەوە بووبێت کە سوپای شـوورەوی هـاتبوو بـۆ یارمـەتیدانی تورکــەکان و بەشــی بـاکووری خۆرئـاوای ئاراراتی بچووکیان داگیر کردبوو. چەند رۆژێـك پێـش شـکانی ئـاگری (م. داهـان) نوێنــەری ئەرمەنییــەکان لــە ناوچــەی جەنگەکــە دوور

کەوتەوەو توانــی لـەکاتی تاریکـایی شـەودا هـەڵێت لـەو کاتـەدا بـوو کەرووسەکانی بینی بوو.}

لە لاپەڕەکانی پێشەوەدا روونمان کردەوە کە داوێنـی راپـەڕینی نەتەوایەتیی کورد بـە نـاوی ناوەندەکەیـەوە ئـارارات تـاکو سـنووری سووریەو عیراق درێژبووبـووەوە تەنـها لـەچیاو دەوروبـەری ئـاراراتدا قـەتیس نـەما بـوو. لـە بـاتی ئـەوەی کـە دەمویسـت تەنــها کورتــە مێژوویەکی ئارارات بخەمـە پێشـچاوی خوێنـدەواران لـە جموجوولـی خۆبەختکەرانی نیشتمان پەروەر کـە لـە رێگـەی بـە دەسـت هێنـانی ئازادیی کورد لە ناوچە جۆر بە جۆرەکانی کوردستاندا. لەگەڵ هێزی تورکدا لەپێکدادانا بوون و فیداکاری لـە ئـەندازە بـەدەریان دەنوانـد باسـێکمان نیشـان نـەدا. ئـەم خۆبەختکەرانـە لـە دوای رووخـانی ئـاراراتیش جمووجوڵـی خۆیـان درێـژە پێـدا بـە تایبـەتی لـە ناوچـە چیاییـەکانی ساسـون و دەرسـیم. لـێرەدا سـەرنجتان بـۆ بەشـێکی وتارەکەی ئەمیر دکتۆر کامەران بەگی بەدرخانیش رادەکێشین کە لە دیدارێکدا بە ناوی کوردستان لە رۆژنامەکەی خۆیدا (لوژۆر) (Ljour) کـە بـە زمـانی فەرەنسـی لەبـەیرووت دەردەچـوو نووسـیبووی: ئـەم بزاڤەی نیشتمان پەروەرانە تاساڵی (١٩٣٨)یش درێژەی کێشا.

رووخـانی ئـارارات زمـانی کاربەدەسـتان و خامـەی نووسـەرانی تورکیەی ژیاندەوە؛ مەحموود ئەسعەد بەگی وەزیـری دادی کۆمـاری تورکیە لە وتارێکدا کە لـە شـاری ئـەدمیش خوێندییـەوەو رۆژنامـەی میللییەتیش لە رۆژی (١٩)ی سبتامبەری (١٩٣٠) بـڵاوی کـردەوە لـە سنووری دەستەڵاتی کۆماری تورکیەدا سیاسەتی بـاڵابوونی نـەژادی تورکی راگەیاند، وتی: (دەبێت دۆسـت و دوژمـن بزانێـت ئاغـای ئـەم

وڵاتە تورکە. کەسانێك کە لەناو دەمارەکانی لە شیاندا خوێنی سافی تورکیان تیا نەبێت لە نیشتمانی تورکیە تەنها یەك مافیان هەیە. ئەویش نۆکەرایەتی و کۆیلەیەتییە) لە(القضیەالکردیە) وە وەرگیراوە).

گەلی کوردی ئازا هەر لەسەرەتاوە هەستی بەم سیاسەتەی کۆماری تورکیە کردبوو. بۆیە نۆکەرایەتی و کۆیلەیەتیی قبووڵنەکردبوو، بۆ پاراستنی شەرافەتی نەتەوەیی و بۆ بەدەست هێنانی ئازادیی خۆی هەزارەها قوربانیی داوە، ئەمڕۆکەش لەبەردەم دادگای دادوەریی ئازادی خوازان بەڵگەیەك کە بەخوێنی شەهیدانی ئازادیخوازانی خۆی نووسیویەتی دەداتە دەست پارێزەرانی مافی زەوتکراوی خۆی.

ڕۆژنامەی میللییەت ئەم سەرکەوتنە کە دەوڵەتی تورکیە لە سایەی کۆمەك و یارمەتیی دەوڵەتی شاهەنشاهی ئێران و لە دوای چەند ساڵێك خوێنرشتن توانیبووی بەدەست بێنێت سەبارەت بە ئاخرین بزووتنەوەکانی کورد کە بۆ وەرگرتنەوەی مافی داگیرکراوی گەلی خۆی هاتبووەکایەوە وای بۆ چووە: وێنەی گۆڕێك کە هەردوو سەری لە سەر لووتکەی ئاگری-ی گەورەو ئاگری-ی بچووك دروستکراوە لە سەر بەردەکەشی نووسراوە (کوردستانی خەیاڵی لێرەدا نێژراوە) لەوە بێ ئاگایە کە بیری ئازادی وەکو لافاوێك کە لە ڕۆحە بێزارەکان و شکەنجەدراوەکانەوە سەر چاوە دەگرێت ئەو بەر بەستانەی کە لە بەردەمیا دروستکراون هەرچەندە بە هێزو مەحکەم بێت لە ئەنجامدا بە فشارێکی بەهێز کەلە پەنگ خواردنەوەی ئاوەکانەوە کۆدەبێتەوە ڕێگەی خۆی دەکاتەوە بە یەکجار هەموو

بەر بەستەکان دادەڕووخێنێت وای لێدەکات کە جـارێکی دیکـە چاك نەکرێتەوە. مەرجی عاقڵی ئەوەیە کە بە دروستکردنی جۆگەی لـەبار لـەو لافـاوە وێرانکـەرە بـۆ ئـاودێری و زۆر بوونـی بەرهـەم سـوودیان لێوەربگیرێت و زەوییەکانی پێ ئاوەدان بکرێتەوە.

نووسەر لێرەدا لە بەرانبەر ئەو کێلە قەبرە نووسـراوەدا بـیروڕای خـۆی دەرنـابڕێت. ئایندەیەکـە نیشـانی دەدات ئایـا کوردسـتان خەیاڵییە یان دەستەڵاتدارانی تورکیـە لـە کوردسـتاندا خەیاڵییـە کـە لەو گۆڕەدا بە خەوی هەمیشەیی ڕۆدەچێت. شتێك کە سـەلمێنراوە، لـە دوای ئـەو مێـژووەوە ئـەو هەیکەلـە کـە ڕۆژنامـەی میللییـەت بـە مردووی دادەنێت لـە سـەر سـینەی ئـارارات نێـژراوە لـە شـوێنەکانی دیکەی کوردستانی تورکیـەدا چـەندین جـار تـەکانی بـە خـۆی داوەو ژیانی دەربڕیوە.

ڕووداوەکانی ئارارات کۆتایی هات لە هەموو شوێنێکەوە هـەوڵدرا کە بە کورتی ببڕێتەوەو کورتەیەکی ئەو ڕووداوانـە کـە بـە سـەر ئـەم چیـا مێژووییـەدا تێپـەڕیوە بگاتـە بـەر چاوی خوێنـدەواران. ئێسـتا خوێندەوارانی بەڕێز تا رادەیەك بـە لـە خـۆ بووردنـەکانی کـورد، بـۆ بەدەستهێنانی ئازادی لە ماوەی جەنگەکانی ئاراراتدا ئاگـادار بـوون. داوای مۆڵەت دەکەم بە ڕێزگرتن لە شەهیدانی ڕێگـای ئـازادیی کـورد کە بۆ ڕزگاربوونی نەتەوەی خۆیان لە پێشکەشکردنی خوێن و گیـان بەختکردندا، کورتییان نەکردووە و گەیشـتوونەتە ژیـانی هەمیشـەیی لە بەردەم ڕۆحی ئەو گەورە پیاوانەدا بەو پـەڕی ڕێـز و گەورەییـەوە سەر دادەنەوێنم بۆ پاشماوەکانی ئەم گەلە دلێرە و خۆبەختکـەرە و دروودی لێخۆشبوونیان بۆ رەوانە بکەم.

### چارەنووسی ئیحسان نوری :

ئیحسان نوری لە دوای ئەوە لە ئێراندا بوو بە پەنابەر ماوەیەك لە تاراندا کەوتە ژێر پرسیارو وەرامەوە،لە دواییدا وەکو چەند کەسێکی دیکەی پەنابەرانی ئاراراتی کە لە شارە جۆر بە جۆرەکانی ئێراندا لە ژێر چاودێریدا بوون بۆ ساوەو یەزد، دوور خرایەوە[1]. لە دوای ماوەیەك بەهۆی ڕووداوی ئەیلولی (١٣٢٠) وە لە سەرەتای ساڵی (١٣٢١) ئیحسان نوری لەگەڵ یووسف عەلی مهاجری و خاتوو بسرە حسنانی، تەیموور جەلالی و شەمسەدین جەلالی، ئێلخانی جەلالی، محەمەد دەروێش سەردانی وەزارەتی ناوخۆی ئێرانیان کرد، داوای ئەوەیان کرد کە گوایە بەهۆی بەرزبوونەوەی نرخی پێداویستییەکانی ژیانەوە یان مووچەکانیان بۆ زیاد بکرێت یان لە ژێر چاودێریدا نەمێننەوە و ئازاد بکرێن تاوەکو خۆیان، بۆ دابینکردنی بژێویی

---

[1] پەژمان لاپەڕە ١٦٠ لەو بەڵگانەی ئەم سەردەمە کە ماونەتەوە باسی ٥٣ کەس لەژن ومنداڵی ئاراراتی دەکات لە یانەی پەروەردەکردنی تەورێزدا لە ژێر چاودێریدا بوون هەروەها ئەمانەی خوارەوەش لە ژێر ناوی کوردی ئارارت– دا لە ناوچە جۆربەجۆرەکانی ئێراندا دوور خرابوونەوە و لە ژێر چاودێریدا بوون : شێخ عەبدولقادر (تاران)، شەمسەدین(مەشهەد)،محەمەد بەگ (تاران)، ئێلخانی (تاران) مسرو (سمنان) ئەحمەد عەلی (سمنان) ڕەبابە خێزانی بروحسو (تاران) بسرە، خێزانی فەرزندە کەلە بەندیخانەدا مرد بوو ئەویش لە(تاران )بوو، وەزارەتی ناوخۆ (ڕوونووسی ڕاپۆرتی کومەسیوونی لێکۆڵینەوەی ئەو کەسانەی لە ژێر چاو دێریدان)بەبێ ژمارە لەڕۆژی ١٣١٣/٣/٧ بەڵگەنامەی ملليی نەتەوەیی (ن) ١٢٢٠٠٢

خۆیان هەنگاو بنێن.[1]

لە سەرەتای مانگی تەمووزی هەمان ساڵدا ئیحسان نوری بەناوی (سەرۆکی لەوەو پێشی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانی کوردستانی تورکیە)وە داوای لە سەرەك وەزیرانی ئێران کرد. ئەو (... . کە یان لە سەر کارێکی لەبار دایمەزرێنن، یا مۆڵەتی بدەن بۆ خۆی سەربەستانە کارێکی باش پەیدا بکات. بەڵکو کەمێك خەرجی بە دەست بێنێت. . . .) و ئەگەر دەوڵەت بەهەر هۆیەکەوە (. . . چاو دێری کردنی ئەویان پێویستە و بە زەرووری دەزانن خەرجییەکی لەبار) کە لەگەڵ بارودۆخی ئەوکاتەدا بگونجێت بدەنیٚ، دەری بڕیبوو کەلە (. . قوتابخانەی بەرزی سەربازی تورکیە لە ئەستەموولٚ) دەرچووە و تەواوی کردووە هونەری تۆبۆگرافیشی خوێندووە. . . لە کاروباری نەخشە کێشاندا کاری کردووە، بەڵام هیچ ئەنجامێکی دەست نەکەوت.[2]

لەم کاتەدا لە سوپای خۆرئاواوە راپۆرتێك هاتبوو. کە گوایە کۆمەڵێك لە کوردەکان بە سەرۆکایەتیی کوڕی سمکۆ و شەریف خانی کوڕی سەید تەها بۆ بردنی ئیحسان نوری چەند نوێنەرێکیان بۆ تاران ناردووە. لە نێوان سەید عەبدوڵلای (کوڕە مامی سەید

---

[1] وەزارەتی بەرگری نووسینگەی سەربازی ژمارە ٧٦٥ -٢٤٠٤ /٥ لە رۆژی ١٣٢١/٢/٣ بەڵگەی میللی(ن) ١٠٣٠٠٣

[2] نامەی رۆژی ١٣٢١/٤/١ئیحسان نوری کە بە ژمارەی ٦٦٦٥ ی رۆژی ١٣٢١/٤/٤ لە نوسینگەی سەرەك وەزیرانی ئێران تۆمارکراوە بەڵگەی میللی (ن) ١٠٣٠٠٣

**تەها**)و سەیف ئەلقوزات و قازی محەمەدو ئیحسان نوری چەند دیدارێك پێك هاتووە، بەڵام شارەوانی لە دوای لێكۆڵینەوە دەریبڕی کە ئیحسان نوری نیازی نییە تاران بەجێبهێڵێت[1] وەزارەتی بەرگریش راپۆرتی بەشارەوانی دا کە بە پێی ئەو لێکۆڵینەوانە کە کراونە خودی ئیحسان نوری نیازی چوونە دەرەوەی لە تاراندا هەیە[2] ئەو کەسانەش کە دیداریان کردووە نیازی بردنی ئەویان هەیە،لەبەر ئەمە بە پێی دانیشتنی شەشەمی مانگی ئەنجومەنی تیری ۱۳۲۱.

تەمووزی (۱۹٦۰) وەزیران، بڕیاری ئازاد کردنی (حەوت کەس لە پەنابەرانی کوردی تورکیە)، یانی ئیحسان نوری و هاوڕێکانی داوە. بەپێی راسپاردەی وەزارەتی (جەنگ =بەرگری) بڕیار دراوە تاکو کاتێك کە ئیشیکی باشیان دەست نەکەوێت بارەگاکانیان. وەکو (بارەگای ئیحسان نوری (۱۵۰۰) ریاڵیان بۆ زیاد دەکرێت هەروەکو جاران بۆیان خەرج دەکرێت)[3] لە چۆنیەتیی گۆڕانکارییەکانی دوایی ژیانی ئیحسان نوری ئاگادارییەکی وردمان لەبەردەست نییە. ئەوەندە دەزانین. لەنێوان ساڵەکانی (۱۳۲۳) تاکو (۱۳۲۵)ی هەتاوی لەگەڵ رۆژنامەی کۆهستاندا هاوکاری هەبووە زنجیرە وتاری

---

[1] وەزارەتی ناوخۆ بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایشی ژمارە ۲۳۹۲ /۹۵۳۸ لە رۆژی ۱۳۲۱/٤/۲۵ و ژمارە ۹٦٤۱/۲۳٦۲ لە رۆژی ۱۳۲۱/٥/۳ بەڵگەی میللی (ن) ۱۰۳۰۰۳.

[2] وەزارەتی بەرگری ژمارە ۱٦۰۹۸/٥۷٥٦ لە رۆژی ۱۳۲۱/٥/۲۹ بەڵگەی میللی(ن) ۱۰۳۰۰۳

[3] وەزارەتی بەرگری روونووسی راپۆرتی فەرمانگەی یەك ژمارە ۲۸٦۲ لە رۆژی ۱۳۲۱/٦/٥ بەڵگەی میللی (ن).

(تاریخ ریشەی نەژادی کرد)[1] و وەقایعی ئاراراتی نووسـی، هـەروەها وا دەردەکەوێت لەسەردەمێکدا بۆ کرمان دوور خرابێتەوە، لـەدواییدا لـە سـاڵەکانی کۆتـایی دەیـەی (١٣٣٠) بـە هـۆی کوودەتاکـەی عەبدولکـەریم قاسمـەوە و ئـەو گۆڕانکارییانـە کەلـە عـێراقدا ڕوویـدا. سیاسەتێکی نوێ لەبەرانبەر کوردەکـانی ناوچەکـەدا. هاتـە کایـەوە، ئیحسان نوری مۆڵەتی پێدرا کە بۆ تاران بگەڕێتەوە لەم سەردەمەدا، ناوبراو هەم لەڕووی بژێوییەوە، هەم لەڕووی ئازادیشەوە لە دۆخێکی باشـتردابوو. تەنانـەت مۆڵـەتی پێـدرا بۆئامـادە بوونـی لـە کۆنفرانسەکانی نێو نەتەوەیی جاری دوو جار بەشداری بکات و بڕوات بۆ دەرەوەی وڵات، ئیحسان نوری لە (٢٩ی ئەسفەندی ساڵی ١٣٥٥) بە هۆی بوون بە ژێر ماتۆڕوە لە تاران کوژرا.[2]

---

[1] ماوەیەك لە دوای ئەوە زنجیرە وتارێکی بەناوی (تاریخی ریشەی نژادی کـورد ) بـە شێوەی کتێبێك سەرلە نوێ چاپکرایەوە ( تاران ئەنجوومەنی ئێران شناسی کـوردی- مـادی- چاپخانـەی سـپهر ١٣٣٣، ١٤٥ لاپـەڕە ) ئارچیبـاڵد ڕۆزوڵـت یشـهەر لـەم سەردەمەدا (فەروەردینی ١٣٢٥) باسی دیدارێکی ئیحسان نـوری دەکـات کەلـە تـاران یەکتریان دیوە. ئارچیباڵد ڕۆزوڵت حەزی لە فێر بوونی وەرگێڕانی صـهبای سـەعیدی، تاران بڵاو کراوەی ئیتیلاعات،١٣٧١ لاپەڕەکانی٣٢١-٣٢٢.

[2] پەژمان لاپەڕە ١٥٣-١٦٨ .

# پێڕستی ناو

ئیحسان نوری پاشا لەگەڵ خێزانەکەی

کاریکاتۆری ڕۆژنامەی مللییەتی تورکی: کێلی قەبر لەسەر کێوی ئارارات، کە لەسەری نووسراوە «کوردستانی خەیاڵی نێژراوە»

دانیشتووەکان: شێخ عەلی ڕەزا، کوڕی شێخ سەعیدی پیران
بە پێوە: لە ڕاستەوە بۆ چەپ: ئیحسان نوری پاشا، تۆفیق ئەفەندی،
فەهمی بەگ و خورشید ئەفەندی
ئەفسەرانی کورد- بەغدا ١٩٢٥

***

# الكتب المطبوعة باللغة العربية

- **الامارة الشدادية الكوردية في بلاد آران (من ٣٤٠-٥٩٥هـ) ٩٥١-١١٩٨م (دراسة سياسية حضارية)**..........إسماعيل شكر رسول
- **اربيل ٨٨ هەولێر ٩٩: (حتى لاتضيع كردستان)**..........رجائي فايد
- **الفدرالية وامكانية تطبيقها في العراق**..........د. محمد عمر مولود
- **جمعية خويبون: (١٩٢٧) (وقائع ثورة ارارات ١٩٣٠)**..........كونێ رەش
- **امارة بادينان: (١٧٠٠-١٨٤٢) (دراسة سياسية اجتماعية ثقافية)** ..........كاوه فريق احمد شاوەلی ئاميدي
- **امارة بوتان: في عهد الامير بدرخان (١٨٢١-١٨٤٧) (دراسة تأريخية سياسية)** .......... صلاح محمد سليم محمود هروري
- **امارة بابان: في النصف الاول من القرن الثامن عشر (دراسة في علاقاتها السياسية مع السلطات العثمانية)**.......... سعدي عثمان حسين
- **حقوق الانسان والمجتمع المدني بين النظرية والتطبيق (دراسة تأصيلية وتحليلية سياسية)** ..........الدكتور كامران الصالحي
- **كوردستان في القرن الثامن الهجري (دراسة في تأريخها السياسي والاقتصادي)**..........د. زرار صديق توفيق
- **الاسلام وحقوق الانسان**..........د. عبدالحسين شعبان
- **الفيدرالية والحكم الذاتي واللامركزية الادارية الاقليمية**..........د. محمد هماوند
- **كوردستان: من بداية الحرب العالمية الاولى الى نهاية مشكلة الموصل (١٩١٤-١٩٢٦)**..........سروه اسعد صابر
- **القضية الكردية في المؤتمرات الدولية**..........د. فؤاد حمه خورشيد
- **وثائق عن الحركة القومية الكوردية التحررية** .......... د. عبدالفتاح علي يحيي البوتاني
- **مقالات متوعة حول مياه، النفط والبيئة**..........د. بيوار خنسي

***

سۆڤیەتی جاران
ئارالق
ئیگدیر
ئاراراتی گەورە
ئارارات
بالیک گۆل
چڤتلیک
ئاراراتی بچووک
دوغوبایەزید
ئابی بەگ
قۆزلوداغی
دامرلی کوپرو
کێوی قوتیس
گورجی بولاغ
بزون سور
یارم قەیە
کێوی قەندەرۆک
کاجوت
ماکو
ئێران
سنووره نێودەولەتییەکان
سنووری ئێران و تورکیا پێش شکانی
کوردەکانی ئارارات
رێگا سەرەکییەکان